سكا و بلوخ

# سیخوڕی و دژە سیخوڕی

K.G.B. <⟺> C.I.A.

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە
مەشخەڵ کەولاسی

لەبڵاوكراوەكانی
نێوەندو چاپو پەخشی برایان

# سیخوڕی
# و
# دژە سیخوڕی

**KGB ⟵⟶ CIA**

نوسینی: بلید وفسكاو بلوخ
وەرگێڕانی لەعەرەبییەوە
مەشخەڵ كەوڵۆسی

سلێمانی ....................٢٠٠٢

ناوی کتێب: سیخوڕیو دژە سیخوڕی
نووسینی: بلید وفسکاو بلوخ
وەرگێڕانی: مەشخەڵ کەوڵۆسی
چاپی: یەکەم
ساڵی: ٢٠٠٢
تیراژ: ٥٠٠ دانە
چاپخانەی: گەنج
سەرپەرشتی چاپو بڵاوکردنەوەی (فواد احمد کەوڵۆسی)

ژمارەی سپاردنی (٤١٣)ی ساڵی ٢٠٠٠ ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

# ڕازێك لە وەرگێڕەوە

لەو ساتەوە کوردستان داگیر و پێشێل کراوە و خەڵکەکەی دیل و کۆیلە کراوە ، جەماوەری خەڵکی کوردستان لە هەموو بەشەکانی کوردستاندا شۆڕش و ڕاپەڕینیان دژ بە حوکمی شۆڤێنی ولاتانی دەوروبەر و داگیرکەری کوردوستان بەرپاکردووە و لە رووی تەمەنیشەوە زۆری خایاندووە و باجێکی گیانی و ماددی زۆر و قەبە و فراوانیش لە پێناوی بەردەوامی پێدانیدا سەرف کراوە ، وەلێ بەبێ ئەنجامێکی دڵ خۆشکەرانە کۆتایی هاتووە و سەرانی شۆڕشەکان بە زۆری لە پرۆتۆکۆڵی موخابەراتی جاڵجاڵۆکەییدا بە گورگان خواردن دراون ...نموونە لەو ڕووەوە هێند زۆرە و لەبەر چاون براناکەم پێویست بکات ئاماژەی پێ بدەین ...ئەم دیاردەیەش کە لە شۆڕشی کوردیدا دەبینرێت دیارە پێویستە تەفسیری بکەین و هەڵوێستەی لەسەر بکەین و وەك دیاردەیەکی ڕۆتینی لێی نەڕوانین ...پێم وایە یەکێك لەو هۆکار و فاکتەرە گرنگ و بناغەییانەی وای کردووە هەمیشە کورد لە مەیدانی موخابەراتیدا بدۆڕێت ، تێنەگەیشتن و بێ ئەزموونی ئەم نەتەوەیە بووە لە مومارەسە کردنی سیخوڕی و موخابەراتیدا ، تێنەگەیشتن ( لەوەی کە چەندە دەزگا موخابەراتیەکان لە دنیادا کار لە بڕیاری سیاسی دەکەن و ڕۆڵیان هەیە لە دروست کردنی ئەو بڕیارانەدا ) وای کردووە کوردان بەتەنها بە بینا لەسەر ڕاگەیاندن و پرۆتۆکۆلە ڕاگەیاندنەکان کار بکەن و هەنگاو هەڵبگرن ،باجی ئەم ڕوکەشی تێگەیشتنەش لە سیاسەتی دەولی لەسەر شانی کوردان قورس کەوتووە ، لە کاتێکدا دەبوایە شۆڕشەکانی کورد هەمیشە پشتی پەردەکانیان بخوێندایەتەوە ...هێنانەدی ئەم ئاواتە گەورەیە پێویست بەوە دەکات دەزگایەگی سیخوڕی و موخابەراتی گەورە بە بودجەیەکی زۆر و توانای ماددی و

تەکنیکی و بەشەریی قەبەو گرنگەوە بێتە بوون ، ئەمەش کاتێك یەتەدی کاتێك کوردان هەست بکەن ( یان ڕاست بلێین ) تێ بگەن لەو ڕاستی‌یەی کە دەزگا موخابەراتیەکان لە هێنانەدی بەرژەوەندی‌یەکانی نەتەوە جیاجیاکانی دنیادا چ ڕۆڵێکی کاریگەر و حەیەوی دەبینن ، بەجۆرێك هەموو بڕیارێکی سیاسی ڕێخۆشکاری لە پشتی پەردەوە بۆ دەکرێت ...ئەو ڕێخۆشکاریەش دەزگا سیخوڕی و موخابەراتی‌یەکان پێی هەڵدەستن ! کێ هەیە نکولی لەو ڕاستی‌یە بکات ؟!

مەبەستمان لە وەرگێڕانی ئەم پەڕتوکە پێکانی دوو خاڵی سەرەکی بوو :

١. ڕونکردنەوەی کاریگەری دەزگا موخابەراتی‌یەکان لەسەر بڕیاری سیاسی دەوڵەتان و هەوڵێك بۆ شارەزا بوون لە سروشتی کارەکە و گواستنەوەی ئەزموونی دەزگا موخابەراتی‌یە گەورەکان وەك ( C. I. A ) و ( K.G.B ) بۆ نێو هزری خوێنەرانی پەڕتوکەکە و ئاشنا بوون بەو ئامڕاز و پێویستیانەی کە زۆر جار لەم بوارەدا بەکار دەهێنرێت ، لەسەروی هەمویشی‌یەوە تیشك خستنە سەر ڕادەی قوربانی دانی ئەوانەی بە پیشەکەوە سەرقاڵ دەبن ، کە هەندێك جار لە پێناوی چالاکی‌یەکدا کە بەرژەوەندی وولاتەکەیان مسۆگەر دەکات گیان لە دەست دەدەن یان لانی‌کەم دەکەونە دەست دوژمن و دوژاری ژیانی دیلێتی و دەستەسەری دەبن .

٢. لە پاڵ وەرگێڕانی ئەم پەڕتوکەدا ڕازێك بۆ خوێنەران بدرکێنین و پێیان بێژین کوردانیش زەرورە دەزگایەکی موخابەراتی هاوشێوەی دەزگا گرنگ و زیندوەکانی دنیایان هەبێت ، ویستمان ڕووی بانگەواز بکەینە هەموو لایەك تاکو هەنگاو لەو ڕووەوە بنێن ، تاکو بە هەڵگرتنی هەنگاو لەو سەرە

ڕێگەیەوە و بەدی هێنانی ئەو خەونە ، شـــەقاوێکی تـری شۆڕشـی کـورد لـە ڕوشدەوە نزیك بکەینەوە ..

ئەمـە بـە چـاو پۆشـین لـە نـاوەڕۆکی پەڕتوکەکـە کـە تایبەتـە بـــە کـــردەوە و چالاکی‌یەکانی دوو دوزگای گرنگی موخابەراتی لە دنیادا .

**مەشخەڵ کەوڵۆسی**

٢٠٠١/٣/٧

## بەشی یەکەم

# «کاتێك جەنگ کۆتایی هات»

بەکۆتایی هاتنی جــەنگی جیــهانی دووەم لــە(١٩٤٥/٨/٢٤ ز)دا ،جـەنگێکی نـوێ لەنێوان دەزگاکانی هەواڵگری سەر بەیەکێتی سۆڤیێت و ئەمەریکادا دەستی پێکرد، ئــەم جەنگە جۆرەها کردەوەی سەرنج ڕاکێشی سیخوڕایەتی بەخۆوە بینی،کەهــەندێك جـار بەکردەوەی قارەمانانەو ڕۆمانسیانە دێنە ناساندن...لــەڕووی ڕاستی یـەوە کـردەوەی غەدر و کووشتن و چاوبەست کردن بوو.

دامــەزراندنی دەزگـای هــەواڵگری (C.I.A)ی ئـەمریکا،بـەرەنجامی ڕاســتەوخۆی کردەوە سیخوڕییەکانی ئەمریکا بوو لەساتە وەختەکانی جەنگدا ...سەرۆك (فرانکلــین رۆزفێلت)هەستی کـرد ،پێویسـتە کـار ڕێکخـەر موخابـەراتی درووسـت بکرێـت بـۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لەجیهاندا بۆ ئەم مەبەستە کابرایــەکی دەوڵەمـەندی دەستنیشان کرد کەلەهەڵگرانی مەدالیای جەنگی یەکەمی جیهانی بوو بــەناوی(ولیـەم .ج.دونوفان)ناسراو بە (وایلد بل)،ولیەم بەو چاوە سەیر دەکرا گوایـە زانیـاری وردی لەسەر دەوڵەتە ئەوروپیەکان هەیە ،بۆیـە بۆئـەم پۆسـتە دەسـت نیشـان کـرا بەتایبـەت دەربارەی وولاتانی (ئیطالیا،ئەڵمانیا،بریطانیا،فرنسا).

پێشوەختیش داواکاری گشتی بووە لەوەزارەتی داد و لەسەر لیستی پارتی کۆماری خۆی کاندید کرد بۆ پۆستی فەرمانداری نیویۆرك لەساڵی (١٩٣٢)دا.

وەك توانجێك لـەسەر دەست نیشانکردن (دونوفان)بۆ پۆستی کار ڕێکخەری دەزگـای هەواڵگری ئەمریکا ،یەکێك لەکارمەندانی دەزگای هـەواڵگری بـەریتانیا لــەو دەمـەدا

دەڵێت (دەتوانین لەمیانەی ئەوپیاوەوە شتی زۆر بەدەست بێنین ،چونکە ئەو پیاوە جێگای متمانەیە)..

پاش ماوەیەك سروشتی کارەکانی (دونوفان) و دەستەڵاتەکانی دەستکاری کران ،کرایە (بەرێوە بەری نوسینگەی خزمەتگوزاریە ئیستراتیژیەکان (ن،خ،ا)لە دوای هێرشە بەناوبانگەکەی ژاپۆنیەکان بۆسەر بەندەری (بیرل)ی ئەمریکی لە گەڵ کۆتای هاتنی جەنگیش دا ئەو نوسینگەیە(١٣)هەزار کارمەندی تایبەتی هەبوو ..بودجەشی گەیشتبووە (٣٧)ملیۆن دۆلاری ئەمریکی ..دوابەدوای دامەزراندنی ئەم نووسینگەیە (٣)بەشی پێوە لکێنرا بەمەستی چاککردنەوەی سیخوڕیەکان ..ئەو (٣) بەشە بەم ناوانەوە ناسرابوون:

١-سکرتاریا ٢-پلان دانان ٣-ئەرکەکانی پشتی دەریا...

هەریەکە لەم سێ بەشە بەچەندگرووپێکی موخابەرات پشت ئەستوور کران بۆراپەڕاندنی ئەرکە تایبەتیەکان ئەو گروپانە ناونران "دەستەکانی کار"..لەنێو ئەندامەکانی ئەم گروپانەدا ،بەر پرس و پسپۆڕ بەدەرکەوتن لە (نوسینگە خزمەتگوزاریە ئیستراتیژیەکاندا) تالە دوایدا بوونە بەرێوەبەرو نوێنەرو کارمەندی پلە بلند لەدەزگای هەواڵگری ناوەندی ئەمریکادا ، کەلە ناوەندە نێو دەولێتیەکاندا بە (C.I.A)دەناسرێت.سەرەڕای گەشەکردنی ڕۆڵی (ن.خ.إ) کەبە ئاشکرا سنوری ئەرکەکانی خۆی بەزاندبوو لەماوەی جەنگ دا (واتە هێندە کارا بووە -وەرگێڕ) ،دونوفان هەوڵی زۆر دا بۆچەسپاندن و پشت ئەستوور کردنی ڕۆڵی ئەم دەزگایە لە ڕۆژگارەکانی ئاشتی داهاتوودا .ساڵی ١٩٤٤ دونوفان نامەیەك بۆ سەرۆکی ئەمریکا دەنوسێت و تیایدا دەڵێت :(پێویستە پارێزگاری بکرێت لەو توانایەی ئێستا لەبەر دەستماندایە )وەلێ هەندێك لەبەرپرسە ئەمریکیەکان بەتایبەت بەرێوەبەری نوسینگەی لێکۆڵینەوە فیدرالیەکان ) (ئیدگار هوفر )،بەدەم بیرۆکەکەی دونوفانەوە نەچوو

،کەدەزگایەکی هەواڵگری دابمەزرێت وەك رکابەری دەزگاکەی خۆی ..بەهەر حاڵ دونوفان لەم هەوڵەیدا سەرکەوتوو نەبوو لەبەردوو هۆ :

١. مردنی سەرۆك ڕۆزفلت لەنیسانی ساڵی ١٩٤٥ دا....

٢. گەیشتنی کەسانێکی زۆر لەنەیارانی سیاسەتەکەی (بیرۆکەکەی )بەپۆستە گرنگەکان ،لەسەردەمی سەرۆك (ترومان)دا .

لەوانە (هارول سمیث) ،کەبەڕێوەبەری بودجە بوو لەوکاتەدا .تێبینی دەکەین شێوازی مامەڵەو زمانی ڕەقی دونوفان لەگەڵ بەرامبەرەکانیدا وای کردبوو بەبەردەوامی ژمارەی نەیارانی بیرۆکەکەی لەزیادبووندا بن .بۆیە لەکۆتایدا(ن.خ.إ) هەڵوەشێنرایەوە ،هەندێك لەبەشەکانی لکێنران بەدەزگای موخابەراتی دیکەوە ...ئەو دەزگایانە دڵنیا کرابوونەوە لەڕۆڵی ئەم بەشانە ،وەلێ دەزگاکان نەیان دەزانی لە پشتی پەردەوە بەشەکانی (ن.خ.إ)خۆیان بۆچی ئامادە دەکەن بەرلەدەست پێکردنی مانگی ئەیلولی ١٩٤٥ ،(جمیس فروستاڵ)ی سکرتێری دەریاوانی ئەمریکی،تێبینی ئەوەی کرد دوبارە دابەش کردنەوی بەشەکانی (ن.خ.إ) و ئەو حاڵەتەی دەزگاکانی تری تێدا دەژی پێویستە چارەسەر بکرێت ..بۆیە داواکرا لەپارێزەرێکی نیویۆرکی بەناوی (فرندیاد أبرستاد)تا ڕاپۆرتێکی یاسایی ئامادە بکات و تیایدا ئامانج و داواکاریەکانی ئیدارەی ئەمریکا لەبواری هەواڵگری و سیخوڕایەتیدا دەست نیشان بکات ..

دوای ئامادەکردنی ڕاپۆرتەکە ،(أبرستاد) بەرەنجامێکی دەستگیر بوو ،بریتی بوو لە (ئەمریکا پێویستی بەدەزگایەك هەیە بتوانێت لەقۆناغەکانی ئاشتی و شەڕدا بەیەکسانی کاری خۆی بکات و ئەو قۆناغانە بقۆزێتەوە ...)دەست بەجێ سەرۆك تروومان دەستەیەکی موخابەراتی نوێی پێکهێنا بەناوی (گرووپی هەواڵگری ناوەندی )(گ.هـ.ن) بەبۆنەی ڕاگەیاندنی ئەم گرووپەوە ووتی :(ئەم وولاتە خوازیاری (گوستابو) نیە لەژێر هەرچی دەمامکێك دا بێت...).. لەهەواڵێکیش دا

بۆ کۆنترۆلکردنی ئەم گروپە کە چالاکیەکانی مانگی لە (١٩٤٦/١) دەستی پێکرد،سەرۆك تroomان چوار پیاوی دەست نیشان کرد بۆ چاودێری ڕەوتی کارەکانی (گ.ه.ن). چوار پیاوەکە بریتی بوو لە :

١-وەزیری دەرەوە ٢- وەزیری جەنگ ٣-وەزیری دەریاوانی

٤-ڕاوێژکاری سەرۆکایەتی...

ئەم چوار پیاوە پێکەوە ناونران(دەسەڵاتی هەواڵگری نیشتمانی )،بەرەسمیش ڕاگەیەنرا (گ.ه.ن)لەکردەوەکانیدا بەرپرسە لەبەر دەم ئەم دەستە چوار کەسیەدا ...بۆ ئاهەنگ گێران بەبۆنەی دامەزراندنی (گ.ه.ن)ەوە سەرۆك ترومان ئاهەنگێکی سازکرد و تیایدا میوانە تازەکانیپێشکەش بەئامادەبوان کرد ،میوانەکان شەبقەو عەبای ڕەشیان لەبەرکردبوو ،ئەمەش نیشانەی پرسیاری لای چاودێران سەبارەت بەدەزگاکە جێهێشت ،نەخاسمە دەربارەی ئامانجەکانی ئەم دەزگایە کەلەبنەڕەتدا بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دامەزراوە نەك بۆ سیخوڕی کردن .

( ئیگۆر گۆزنکۆ ) ی جیابووەوەی سۆڤێتی لە ئەیلولی ١٩٤٥ دا پەردەی لادا لەڕووی مەترسیدارترین تۆری موخابەراتی سۆڤێتی لە ئەمریکای باکوردا.. گۆزنکۆ ڕوخساری خۆی بە دەمامکێکی ڕەش داپۆشیوە لە وێنەکەدا لە ترسی بەشوێندا چونەکانی KGB لە کەنەدا ، کە لەوێندەر بریاری مانەوە و نیشتەجێبوونی دابوو .

لەلایەکی ترەوە ،(ئەمیراڵ سیدنی سوارز)کرایە بەڕێوەبەری یەکەمی ئەم دەزگایە ،بەڵام ئەم کارەکەی بەهەند وەرنەگرت،بۆیە پاش تێپەڕبوونی (٦)مانگ بەسەر دەست بەکاری بوونیدا دەستی لەکار کێشایەوە ،و وژەنەراڵ (هویت ڤاندنبرگ)کرایە دووەمین بەڕیوەبەری (گ.ه.ن)لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بکەین

بەوە ژەنەراڵ (هویت) پێشتر لەپۆستی (ڕاوێژکاری سەرۆك بۆ کاروبـاری هـەواڵگری) کاری کردبوو .خاوەنی عەقڵیەتێکی سەرکەوتووی سیخوڕایەتی بوو ،هەروەها بـرازای (سـیناتۆری ئـەمریکی سـەر بـەپارتی کۆمـاری ئارثـەر ڤاندنـبرگ) بـوو ...بەدەسـت بەکاربوونی لەو پۆستە نوێیەدا (ڤاندنبرگ)سێ سەرپیاوی دیکەی بۆ ڕاپەڕاندنی باشتری کارەکانی دامەزراند.شاڵاوێکی بەرفراوانیشی دەست پێکرد بۆ دارشتنی مافی سیخوری کـردن لـــە ئـــەمریکای لاتینـــی دا لـــەدەزگای (نوســـینگەی لێکۆڵینـــەوە فیدراڵیەکان)(ن.ل.ف)... هەروەها توانی بڕیارێك لەوەزارەتی جەنگـەوە دەربکـات و تیایدا مافی چاودێری کردنی (بەشی سیخوری و زانیاریە نهێنیەکان )بۆخـۆی بپچرێـت کەلە بەردا سەربە (ن.خ.إ)بوو...

(بەشی سیخوڕی و زانیاریە نهێنیەکان )پێشتر (٦٠٠)کارمەندی هەبوو لەگروپـەکانی پشـتی دەریاکانـەوە کاریـان دەکـرد لـەڕیزی (١٠٠٠) کارمـەندی ئـــەو گروپـــەدا ...لەدوایدا لەدوایدا بەرپرسانی (گ.ه.ن)توانیـان دووبەشـی تـری گرنگـی (ن.خ.إ) بخەنە پاڵ خۆیان ، بەشەکان بریتی بوون لە :

١. نوسینگەی خزمەت گوزاریەکان :بەرپرسیاری کۆکردنەوەی ئەو زانیاریانە بوو گەلەهەندەران دا لای خۆبەخشە ئەمریکییەکان چنگ دەکەوت .

٢. بەشی زانیاریە ئێستگەییە دەرەکیەکان ...

لەسەر ئاستی خودی گەشەسەندنیشدا ، (گ.ه.ن) توانی پەیوەندی بـەتین لەگـەڵ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکادا ببەستێت هەروەها پەیوەندی ڕاستەوخۆشـیان لەتـەك ئەوپسـپۆڕانەدا گـرێ دا کەلـەوەوپاش ئاژانسـێکی هێمنایـەتیان پێکـهێنا بـــەناوی (ئاژانسی ئاسایشی نەتەوەیی) (أ.أ.ن)ەوە .. لەم قۆناغـەی گەشـەکردنیدا ،ژمـارەی کارمـــەندانی (گ.ه.ن) گەیشـــتە (٢٠٠٠)کارمـــەند.لـــەدوای ســـەرکەوتنی هاوپەیمانەکان لەجەنگی دووەمی جیهانیدا ،ئیدی ڕۆژ بـەڕۆژ پانتـایی ناکۆکیـەکانی نێوان ئەمریکاو سۆڤیەت فراوانتر دەبوو ،بەتایبەت دوا بەدوای بڵاوبوونـەوەی ئـەو

هەواڵانەی کەباسیان لە چالاکی چڕوپڕی سۆڤیەت دەکـرد لـەبورای سیخوری‌دا ساڵی ١٩٤٥،(ئیگۆر گوزنکو)ی کارمەندی بلند پایەی باڵویزخانـە سـۆڤیەت لـە (ئۆتادا :کەنەدا) پەردەی لـەڕووی کۆمەڵێك دیکۆمێنتـی نـهێنی سـۆڤیەتی لادا کـە تایبــەت بــوو بەشــانە ســـیخوڕیەکانی ســـۆڤیەت لەهەریەکـــە لەکەنـــەداو ئەمریکادا.لەکاتێکدا لەباڵویزخانەکەی جیابوویەوە ..

ئەو دۆکیومێنتانە کە (گوزنکو)لەکاتی هەڵهاتنی لەگەڵ خۆی لە باڵویزخانەکـەی فڕاندبونی ،پەردەی لادا لـەڕووی پەیوەندی ژێر بەژێری هەندێ لەبەر پـرس و زانـا کەنەدیەکان بەدزین و ناردنی زانیاری بۆ سۆڤیەت لەبواری درووستکردنی چـەکی ناوکي دا ..لە ئەنجامدا (٢٢)کـەس بەتۆمـەتی سـیخوڕی کـردن بـۆ بـەرژەوەندی یەکێتی سۆڤیەت دەستگیر کران ...(گوزنکو ئاماژەی دا بە مامەڵەی ئەنتۆنی بلانت لەگەڵ موخابەراتی سۆڤیەتی دا ،بەڵام ئینگلیزەکـان بـۆ مـاوەی بیسـت سـاڵ لـەم مەسەلەیە بێدەنگ بوون ).

لەیەکێتی سۆڤیەت لـەسەر ئاستی چـالاکی سـیخوڕی دا بـارو دۆخ جیـاواز بـوو ،ئـەوەبوو لەگــەڵ کۆتــای هــاتنی جــەنگ دا (لاڤرنتـــی بریــا)ی پیـــاوی ستالین،بەڕێوەبەرایەتی تۆڕێکی هەواڵگری زەبەلاحی گرتە ئەستۆ،کەپیاوانی پۆلیسی نـهێنی سـەر بەهــەردوو کۆمیســاریای (گــەل بۆکــاروو بــاری نــاوخۆ)و(ئاسایشـی دەولـەت)ی لـەبەر دەسـتا بـوو لەئـەمریکا لەبەرامبـەر ئـەم دەزگایـەدا (ن.ل.ف)ی بەرپرس لـە ئاسایشی ناوخۆیی و (C.I.A) ی بەرپرس لەکارو بارەکـانی ئاسایشـی دەرەکی دانراوە.

جێگەی وەبیر هێنانەوەیە هەموو کۆمیسیاریاکان لـەیەکێتی سۆڤیەت دا لـــە ساڵی (١٩٤٦)دا کرانـە وەزارەتـی ڕەسمـی ..(لاڤرنتـی بریـا)ش بویـە دووەمـین پیـاوی دەستەڵات دار لـەدوای ستالین...لاڤرنتی بەبـەکارهێنانی دەسـەڵاتە هێمنایەتیـەکانی

توانی سەرکووتی نەیارە حیزبی و ناوخۆییەکانی بکات ،لەو کاتەوە (ئۆردوگای دەستگیرکردنە کۆمەلایەتییەکان )لەو وولاتەدا دامەزرێنرا...

جگە لەوەش لەسەردەمی (بریا)دا ماراسۆنی خۆ پڕ چەککردن گەیشتە لووتکە ،دەست کەوتنی زانیاری سەبارەت بەچۆنێتی درووست کردنی بۆمبی ناوکی بویە تاکە خولیاو ئەرکی هەواڵگری سۆڤیەتی وەك زانراویشە ئەمریکا لەسەرەتای درووتسکردنی بۆمبی ناوکیدا سوودی لەپێش کەوتنی نازی ئەڵمانیا لەرووی تەکنەلۆجیاوە وەرگرت.

سەبارەت بەیەکێتی سۆڤیەتیش بەهەمان شێوە سوودی لە ئەڵمانیا وەرگرت و زانیاری بەنرخی زۆری لێیانەوە چنگ کەوت ،بەتایبەت لەوزانا ئەڵمانیانەوە کەبەزۆرەملێ لەدوای جەنگەوە گوێزرانەوە بۆ یەکێتی سۆڤیەت ،دەگوترێت گوایە وەزارەتی جەنگ نزیکەی (٦)هەزار زانای ئەڵمانی لەساڵی ١٩٤٦ دا گواستۆتەوە بۆ یەکێتی سۆڤیەت و ژمارەیەکیان تا ساڵی ١٩٥١ مانەوەو سەرجەمیشیان پسپۆڕ بوون لە دروستکردنی بۆمبی ناوکیدا هەروەها دەشگوترێت ئەمریکاو سۆڤیەتیەکان پێکەوە هەستاون بەپشکنینی جێگەی تۆڕی مووشەکی ئەڵمانیەکانی جۆری (٧٢)بەئامانجی دەست کەوتنی زانیاری و توانای شەخصی لەوبوارەدا ..هەرچەندە ئەو زانیاریانە ڕاستەو خۆنەبوونە یارمەتی دانی یەکێتی سۆڤیەت لەدرووستکردنی بۆمبی ناوکیدا بەڵکو بۆمبە ناوکیەکەی لەمەڕ سۆڤیەت بەرەنجامی ڕاستەو خۆی هەوڵو کۆششی هەواڵ دەر و بەکرێگیراوەکانی سۆڤیەت بوو ...ئەو ململانێ سیاسی یەی گۆڕەپانی جیهانی لەسییەکان و قۆناغی جەنگی جیهانی دووەمدا بەخۆیەوە بینی ،یارمەتی یەکێتی سۆڤیەتی دا بۆ وەگەڕخستنی توانا زانیاریەکان و ڕۆشنبیران لەپێناوی سەرخستنی کۆمۆنیزم دا ...

بڕوای زاڵ بوون بەسەر هۆشمەندی ئەوڕۆشنبیرانەدا بریتی بوو لەوەی ،کۆمۆنیزم تاکە ڕزگارکەری مرۆڤانە لەتەنگ و چەڵەمەکانی سەرمایەداری ئابووری و

مۆتەکەی فاشیەت و ڕەگەز پەرستی لەلایەکی ترەوە یەکێتی سۆڤیەت سوودی لە سیفەتی هاو پەیمان وەرگرت،لەماوەی جەنگ دا چونکە دەولەتە ڕۆژئاواییەکان دوودڵ بوون لەوەی دۆستانی کۆمۆنیزم و ئەوانەی زانیاری بۆ دەنێرن بەخیانەت کارو سیخورِ ناوبەرن ...بەو جۆرە یەکێتی سۆڤیەت بەردەوام زانیاری هەبوو دەربارەی دوا گۆڕانکاریە زانستی یەکانی ڕۆژئاوا لەبواری درووستکردنی چەکی ناوکیدا ...

لەوانەیە (کلاوس فوتشز)یەکێك بێت لە گرنگترین (سیخورەکانی ئەتۆم)کە لەبەرژەوەندی سۆڤیەت کاریان کردبێت ،ئەم (فوتشز)ە ، خەڵکی ئەڵمانیاو سەر بەشیوعیەکان بوو ،لە دەست ستەم کاری نازیەکان هەڵاتبوو ..بەهۆی توانا زانستیەکانیەوە لەبواری ئەتۆم دا توانی لە پرۆژەی (مانهاتن)ی تایبەت بەدرووست کردنی بۆمبی ئەتۆمی دا کاربکات و،لە دوایشدا بوویە سەرۆکی (بەشی فیزیای تیۆری) لە (سەنتەری لێکۆڵینەوەی ئەتۆمی بەریتانی ) لە (هارویل) لەماوەی کارەکەشی دا توانی زانیاری نهێنی بۆ سۆڤیەتیەکان ڕەوانە بکات .. لەسەرەتای ساڵی ١٩٤١ تا ساڵی ١٩٥٠ ئەوەبوو لەو ساڵەدا کارەکەی ئاشکرا بوو ،دەستگیرکرا ،یەکێکی تر لەو فیزیاییانەی لەبەرژەوەندی سۆڤیەت کاریان دەکرد (ئالان نای مای )بوو، ئەم توانی چەند نموونەیەك لەو(یۆرانیۆمە) بگوازێتەوە بۆ سۆڤیەت کەلە پرۆژەی (ئەنگلۆ-کەنەدی) ئەتۆمی سەر بە(بەریتانیا-کەنەدا) دا بەکار هێنرابوو ،دوای ئاشکرا کرانی تۆڕی سیخورەکانی سۆڤیەت لەلایەن (گوزنکو)وە ئەم سیخورەش دەستگیرکرا ،جگە لەوانیش هەریەکە لە (خولیوس) و (ئاشل روزنبرگ)یش زانیار ئەتۆمیان گواستەوە بۆ سۆڤیەتیکان و هەردووکیشیان لەساڵی (١٩٥٣)دا لە ئەمریکا لەسێدارە دران ،هەروەها (دۆناڵد ماکلین) یش زانیاری بۆ سۆڤیەتیەکان گواستۆتەوە و ئێمە لەبەشی پێنجەمدا باس لەرۆڵی (دۆناڵد ماکلین)دەکەین.

لەگەڵ بەدەر کەوتنی زانایانی ئەتۆمی سۆڤیەتی وەك (ئەندریە زاخارۆف)،ڕەواجی بیرو بۆچوونی ئەوکەسانە چاشەکشەی کرد کە پێیان وابوو سەرجەم ئەزموونی ئەتۆمی سۆڤیەتیەکان دەگەڕێتەوە بۆ چالاکی سیخوڕیلەساڵی١٩٤٧ دا جیهان بەرەو پێشەوە چونێکی نەوعی لەسەر ئاستی چالاکیە هەواڵدەریەکان بەخۆیەوە دەبینێت،یەکێتی سۆڤیەت لیژنەیکی زانیاری درووست کردکە سەرەڕای یەکەکانی هەواڵدەری دەرەکی (سەر بەوەزارەتی ناوخۆ )،چەندیەکەیەکی لەدەزگای هەواڵگری سۆڤیەتیدا گرتە خۆ .لەکاتێکدا وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا درووستبوونی (C.I.A)ی ڕاگەیاند.لەدوای دەرچوونی یاسای ئاسایشی نیشتمانی،کە بەرۆڵی خۆی (گ.ه.ن)هەلّوەشاندەوە و (دەسەلاتی هەواڵ دەری نیشتمانی )شی گۆڕی بە (ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی)(أ.أ.ن) ... شیاوی باسە (یاسای ئاسایشی نیشتمانی ) سەرۆکی ئەمریکی سەر پشك کرد بۆ سەرۆکایەتی (أ.أ.ن) ،لەپێناوی ئاسانکردنی کردەوەکانی پەیوەندی کردن لەنێوان (C.I.A)و کۆشکی سپیدا ... (C.I.A)یشی ڕاسپارد بۆ کۆکردنەوەی زانیاری نهێنی لەڕێگەی میکانیزمەکانی سیخوڕایەتیەوە و کردیشە لێپرسراو لەبەردەم (أ.أ.ن) دا.هەمان یاسا کە لە (١٩٤٧/٩/١٨)دا دەرچوو (C.I.A)یشی سەرپشك کرد بۆ هەستان بەئەرکێکی تر بەپێی داواکاری (أ.أ.ن) و داواکاریەکانی ئەنجوومەنەکە ئەرکەکان زیاتر بریتی بوون لە :

١. ڕێنموونی کردنی (أ.أ.ن) دەربارەی چۆنێتی ڕێڕەوکردنی چالاکی ئەو دەزگا حکومیانەی سەر بەئەنجوومەنەکەن.

٢. تویژینەوەو ئامادەکردنی ئامۆژگاری تایبەت بەهاریکاری لەنێوان ئەودەزگایانەدا

٣. هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی زانیاریەکانی تایبەت بەئاسیشی نەتەوەیی.

٤ . کارکردن بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکی تر کـە کاریگـەری لەسـەر ئاسایشـی گشـتی هەبێت هتد. بەو شێوەیە ،یاسای ئاسایشی نیشتمانی ئـەرکی سـەرەکی (C.I.A) یی لە قالّب داو کردیە ئەرکێکی لاوەکی ...

ئەمیر (رومسو هیلونکوتر) ی پیاوی پێشووی هـەواڵدەری دەریـاوانی و ڕێکخـەری تۆڕی تایبەتی سیخوڕی سەربە دەریاوانی لـە (باسیفیك) کرایە بەڕێوەبـەری (C.I.A) ...سـەرەڕای ئـەوەیش ئـەوروپا بەدابەشـکراوی لـەنێوان ڕۆژهـەلاّت و ڕۆژئـاوادا مایەوە،ئەمەیش وایکرد ببێتە گۆڕەپانی ململانیّ و بازوو نیشاندان لـەنێوان (C.I.A) و دەزگای هەواڵگری سۆڤیەتیدا ...وەك زانراویشە ئەو دەوڵەتە ئەوروپیانەی سۆڤیەت لـە جەنگی نازیەکانی دەرهێنان ،بـەهاوکاری شـیوعیە ناوخۆییـەکان ،بوونـە هاوپـەیمانی سـۆڤیەت ..دەزگاکـانی هەواڵدەریشـیان بوونـە بووکـە شووشـە لەبـەردەم دەزگـای هـەواڵدەری سـۆڤیەتدا ...ئـەم فاکتـەرەش یارمـەتی بریـای پیـاوی سـتالینی دا لــە موخابەراتی سۆڤیەتی دا ،تـاکو هـەژموونی سـتالینیەت بەسـەر ئـەورووپای ڕۆژهـەلاّتدا بەبەردەوامی بهێڵێتەوە بەپێی بنەماکانی بەرگری لەمافی سـتالین لـە هـەژموون داریـدا ،(جان ماساریك )ی وەزیری دەرەوەی (تشیکۆ سلۆڤاکیا)کە کەسایەتیەك بوو سـتالین خۆشی بـەچارەی نـەدەهات ،ڕۆژی (١٩٤٨/٣/١٠) لـەدەرەوەی ماڵەکـەی خۆیـدا تیرۆر کرا ،لەڕاگەیاندنی ڕەسمی مردنەکەیدا هاتبوو ،گوایە ماسـاریك خـۆی کوشـتوەو هۆکاری کوشتنەکەشی نادیارە ،لەکاتێکدا هەواڵی تر ئاماژەی دەدا بـەوەی ماسـاریك کـوژراوە ...پـاش ماوەیـەکی کـوورت یـاخود لـەمانگی (ئایـار)ی هــەمان سـاڵدا ،موخابەراتی سۆڤیەتی توانیسەرجەم کاندیدە شـیوعیەکان لـەپراگ لـە هـەلّبژاردن دا سەربخات بەبیّ نارەزایی هیچ گروپێکی ڕامیـاری تـر ...لەوکاتـەدا، ڕابـەری شـیوعی پۆلۆنی (فلادیسلوگومولکا) لەپۆستەکەی دارنرا بەو پێیەی لەسیاسەتە ناوخۆییـەکانیدا سەربەخۆیە .. چونکە بەپێی بۆچوونی ستالینیەت بۆ ئەو ووشەیە تاوانێکی گەورە ئەنجام دراوە(وەرگێڕ).

هەروەها لەئەورووپاشدا ،ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی مەترسی دار لـەنێوان ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئاوا لـەسەر بەرلین سەری هەڵدا ،لەکاتێکدا سۆڤیەتیەکان ئابلۆقەیـەکی ووشـکانی بەرلینی ڕۆژئاوایان دا بۆناچارکردنی سوپا ڕۆژ ئاواییـەکان بەپاشەکشـە ،بـەڵام وولاتـە یەکگرتوەکانی ئـەمریکا بـەهاوکاری بـەریتانیا پردێکـی هـەوایی درووسـت کـرد بـۆ باربوکردنی دانیشتوان و سـەربازەکان لەبـەرلینی ڕۆژئـاوا بـە خـۆراك و کـەل وپـەلی پێویست ..ئەمریکیەکان سەرکەوتن لە شکست پێـهێنانی پلانـی ڕووبەڕووبونەوەکـە بەبێ ئاشکرا کردنی هۆکارەکانی ... ئامادەکـاریی و لێـك خوێنـدن و ناکۆکیـەکانی نێوان دوو زلهێزەکە پێشی ڕووداوەکان کەوتبوو لە ئەورووپادا و بەڵکوو هۆکاربوون بۆ سەرهەڵدانی (ڕووداو) لەئەورووپادا...

لەیەکەم دانیشـتنی (أ.أ.ن) ی ئـەمریکی لـەمانگی (١٩٤٧/١٢ ز)دا ،ئەنجومەنەکـە ئاگاداری دا بەمەترسی کۆمۆنیزم لە ئەورووپاو جیـهاندا ... هـەروەها دڵـە ڕاوکێشـی دەربڕی سەبارەت بە بەهێزی (حیزبی شیوعی ئیتالیا)لـەقۆناغی پێش هەڵبژاردنـەکانی ئیتالیا لە ساڵی ١٩٤٨دا.

زۆرینەی چاودێران بۆچونیان وابوو شیوعیەکانی ئیتالیـا سـەرکەوتنێکی گـەورە لـە هەڵبژاردنەکانی( ١٩٤٨ز)بەدەست دێنن، گـەربێت و ڕاسـتەو خـۆ ڕۆژئـاوا دەسـت وەرنەداتە هەڵبژاردنەکانەوە.

لەبەر ئەوە سەرۆکی بەشی ئاڕاسـتەکردنی ڕامیـاری لـەوەزارەتی دەرەوەی ئـەمریکا (جۆرج کینیان)دەربارەی مەترسی کۆمۆنیزم دەنوسـێت: (ئیتالیـا خـاڵی وەرچەرخانـە بەرێڕەوی شیوعیەتی لەئەورووپادا گەر شیوعیەکان لـەوێندەر سـەربکەون،ئـەوا لـەسـەر حیسابی مۆڵگەکانی ئێمـە لەهـەموو جێگەیـەك سـەرکەوتوون ،هـەموو مۆڵگـەکانمان لەدەریای سپی ناوەڕاست و ئەورووپادا)..

ڕێڕەوی‌شیوعیەت لە ئەوروپادا، گەر شیوعیەکان لە وێندەر سەربکەون، ئــەوا لەســەر حسابی مۆڵگەکانی ئێمە لــە هــەموو جێگەیــەك ســەرکەوتوون، هــەموو مۆڵگەکانمانلــە دەریای سپی ناوەڕاست وئەوروپادا...)..

بــەو شــێوەیە (ئیتالیــا)بوویــە پێگــەی یەکــەم تاقیکردنـــەوەبۆ کـــارایی (C.I.A) و(هیلونگوتر )ی بەڕیوەبەری، کەبەردەوام ڕاسپاردەو ئامۆژگاری پێدەگەیی، دەربارەی ڕێکخستنی چەند زنجیرەیەك کردەوەی نهێنی بۆ قەلاچۆکردنی حیزبی شـیوعی ئیتـالی و یارمەتی دانی گروپە ڕامیاریــەکانی تــر ...ئــەوەبوو (هیلونکوتــر)دەســتەیەکی پێکــهێنا بەناوی (فرقة التدابــر الخاصــة)بــۆ کــارکردن لــەژێر چــاودێری (نوســینگەی کــردەوە تایبەتەکان )لە (C.I.A)، پیاوێك بەناوی (جیمــس ئــەنگلتون)کرایــە ســەرۆکی ئــەو دەستەیە، ئەو پیاوە بەزیرەکی و توند و تیژی ناسرابوو، بــەر لــەدەســت کــردن بــەجێ بەجێ کردنی ئەم ئەرکــە (هیلونکوتــر)داوای ڕوونکردنــەوەی یاســایی لــەڕاوێژکاری یاسایی (C.I.A) کرد، دەربارەی ئەوکردەوانەی بڕیارە لەئیتالیادا جــێ بــەجێ بکــرێن وەڵامەکەی بەنەخێر وەرگرتەوە.

بەڵام پشتی بەڕاوێژکردنەکە نەبەست، بــەڵکو بڕیــاری دا هــەلێك بداتــە (C.I.A) بۆچونە نێــو کــارێکی بــەو جــۆرەوە لــەدوای ئــەوە، بــڵاو کــراوەی دژ بەشــیوعیەت لەئیتالیادا چاپ کرا، پۆستکارت بەدیوارەکانی ڕۆماو هەموو وولاتدا لکێنرا هــەروەها ووتاری دژ بەکۆمۆنیزم بەسەر بڵاوکراوەو ڕۆژنامــەکاندا دابەشــکراجۆرەها درۆ ڕێــك خران دەربارەی حیزبی شیوعی لــەپاش ساختە کردنی دیکۆمێنتتایبەت ...بودجەی ئــەم شاڵاوە (٧٥)ملیــۆن دۆلار بــوو، ســەرجەم داراییەکــەش بەســەر پــارت و کەســایەتیە نەیارەکانی حیزبی شیوعیدا دابەش کرا شــیاوی باســە (جیمــس فورســتاڵ)ی وەزیــری بەرگری ئەمریکا لەوکاتەدا هەڵمەتێکی بــاربوو کۆکردنــەوەی لــەڕیزی دەوڵەمــەند و پیــاوانی بورصــەی ئــەمریکادا دەســتپێکرد لــەژێر نــاوی (قــەڵاچۆ کردنــی مەترســـی شــیوعیەت)، لەهــەموو شــارەکانی ئەمریکاشــدا دەنگــی ووتـــار بێـــژ و بـــرەو دەران

بەپروپاگەندە بەرز بوویەوە بۆ قەلاچۆ کردنی هەمان مەترسی سەرۆك ترومان لەوەش پتر چووکاتێك بڕیاری بڕینی هاوکاری لەهەرکابینەی حکومەتێکی ئیتالی دەرکرد کەشیوعیەکان بەشداری تێدابکەن .ئەم هەڕەشەو گوڕەشانە کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر دەنگدەرە ئیتالیەکان و چارەنووسی ڕامیاری وولات ...لەئەنجامدا شیوعیەکان نەیان توانی بگەنە دەستەلات، ناشزانین ئایا هۆکاری شکستی شیوعیەکان دەگەڕێتەوە بۆ هەلمەتەکانی (C.I.A)بەتەنها ،یاخوود دەنگدەرە ئیتالیەکان ویستویانە مەترسی مۆتەکەی شیوعیەت لەوولاتەکەیان دوور بخەنەوە ،دوای ئەو زنجیرە ڕووداوەی ئەورووپای ڕۆژهەلات بەر لەهەلبژاردنەکان بەخۆیەوە بینی ...دەمێنێتەوە ئاماژە بدەین بەگرنگی و قەبارەی ئەو هەولانەی (C.I.A)وەگەڕی خست لەبەرانبەرکێی شیوعیە ئیتالیەکان و شادمانی بەخشین بەسەرۆك ترومان ...دوا بەدوای سەرکەوتنی (C.I.A)لە جێبەجی کردنی ئەرکەکانیدا ،ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لە (١٩٤٨/٦/١٨)دا کۆبوونەوەیەکی کت وپری گرێدا،لەمیانەی ئەم کۆبوونەوەیەدا ئاماژەی ژمارە (١٠/٢)دەرچوو،سەبارەت بەدامەزراندنی دەستەیەکی هەمیشەیی بۆکردەوە نهێنی یەکانی لەژێر ناوی (نوسینگەی تەنسیقی ڕامیاری) (ن.ت.ر) بەمەرجێك (C.I.A)پارێزگاری لەم جۆرە کردەوەیە بکات لەمیانەی (فرقة التدابر الخاصة)ەوە...ئاماژەکەی گۆرین ئەم ئاراستە کاریانە لە خۆگرتبوو ((پێوسیتە جێبەجێ کردنی کردەوە نهێنیەکان بەشێوەیەکی وورد و ڕێك و پێك بێت ،بەجۆرێك ئاسان ئیدارەی ئەمریکا جیاوازی بکات لەنێوان بەرپرسیارێتی حکومەت لەو کردەوانە لەگەل جێبەجێ کەرانیدا کە بەرەسمی تەوزیع نەکراون بۆهەستان بەو کردەوەیە ..هتد)) لێرەدا ئاماژە دەدەین بەوەی یەکەم بەرپرسی (ن.ت.ر) (فرانك ویزنر)ی کارمەنی پێشووی (ن.خ.إ) بوو...

سالّی (۱۹٦۳)سەرۆك ترومان ووتی(لەو کاتەدا دامەزراندنی (C.I.A) م ڕاگەیاند ،بڕوام نەدەکرد بەوەی ئەم دەزگایە لەداهاتوودا عەبای ڕەش لەبەر دەکات ،لـەڕۆژانی ئاشتی و ئاشتەوایشدا کردەوەی خەنجەری جێبەجێ دەکات ).

لەلایەکی ترەوە (C.I.A)سوودی لەو یاسایە وەرگرت کەسالّی ۱۹٤۹ز دەرچوو بەناوی یاسای (C.I.A)،وتیایدا (C.I.A)دەبەخشـرێت لەسـەرجەم حوکمـەکانی یاسای فیدرالّی کەدەزگاکانی کەرتی ڕەسمی کـاری پێدەکـەن دەیکەنـە مـەرج بەسـەر بەرپرسەکانیەوە تا(کـار و نـاوو مووچـەو ژمـارەی کارمـەند)ەکانیـان ئاشـکرا بکـەن ،هـەروەها سوودیشـی وەرگـرت لـەو دەسـتەلاّتە بەرفراوانـەی بـەپێی یاسـا دراوە بەبەڕێوەبەرەکەی ،بەمافی خەرج کردنـی دارایـی و بەکارهێنانییـەوە بـێ پابـەند بـوون بەبودجەی دیـاری کـراوەوە جگـە لـەوەش یاسـاش مـافی ئەویشـی دا بەبەڕێوەبـەری (C.I.A)کەسالاّنە بۆی هەیە (۱۰۰)بیانی بهێنێتە وولاّتـەوە بـێ ئـەوی پابـەند بێـت بەیاساکانی کۆچەوە..

ماوەتەوە بێژین دەرچونـی یاسـای (C.I.A)و دامـەزراندنی (ن.ت.ر) دووکـاری گرنگ بوون لەزنجیرەی ئەوکردەوە یاسا سازیانەدا کەچوار چێوەی کردەوە نهێنیەکانی (C.I.A)یان وینا کرد لەماوەی (٤۰)سالّ دا وەلّێ پێویستە ئاماژەیش بدەیـن بـەوەی ئەوگۆڕانکاریانـەی لـەمیتۆدەکانی جێبـەجێکردن یـاخود لەتێکـەلّکردنی بەشـە سیخوڕیەکان تەنها گۆڕانکاریەکی لاوەکیبوون لەبەر دەم ئەو هـەموو ئازادیـەی یاسـا بەدەزگای هەوالّگری دابوو.

## بەشی دووەم

# ﴿ یەکەمین کردەوەی نهێنی ﴾

لەسەرەتای قۆناغی جەنگی جیهانی دووەمدا (ن.خ.إ) هەموو توانا موخابەراتیەکانی خۆی لەوناوچانەدا چڕکردەوە کەسوپای ئەڵمانیا داگیری کردبوو،بەتایبەت لەو جێگایانەدا کەشۆڕشگێڕانی دژبەو سووپایەی تێدابوو پاش کۆتایی هاتنی جەنگیش زۆربەی بەکرێگیراوانی سەر بە (ن.خ.إ) ڕوانینی خۆیانیان نەگۆڕی بەرامبەر ئامادەگی سۆڤیەت لە ئەوروپای ڕۆژهەلاتدا ،بەڵکو لەگەڵ سۆڤیەتیشدا بەهەمان شێوەی سوپای ئەڵمانیا جوولانەوە و زنجیرەیەك کردەوەی نهێنیان ئەنجام دا کە بە(جەنگی سیخوڕان )ناسرا یەکەمین کردەوەی ناونرا فڕوفێڵەکەی ئەلبانیا .

تاکو ساڵی ١٩٤٨ ئەلبانیا لەشانۆی نێو دەوڵەتیەوە بەدوور بوو ،بەو پێیەی دەوڵەتێکی دواکەوتووە لە دەوڵەتەکانی (بەلتیق ).. وەلێ ئەو جیاوازیانەی لەنێوان ڕابەری کۆمۆنیستی یوگسلافیا (جۆزیف بروزتیبو)و(ستالین ) دا بەدەرکەوت بویە تیشك خستنە سەر ئەلبانیاو گۆڕانی مەوقیفی ڕامیاری ئەو وولاتە لەسەر نەخشەی سیاسی جیهاندا ..پاش هەستانی (ستالین )بەدەرکردنی ئەلبانیا لەڕێکخراوەی دەوڵتە کۆمۆنیستیەکان لە ساڵی ١٩٤٨دا (تیتۆ )دەستی کردە هاوکاری کردنی ئەلبانیای هاو سنووری لەسەر هەردوو ئاستی ئابووری و سەربازی لەهەولێکدا بۆ بەدەست هێنانی دۆستایەتی ڕابەری شیوعیەکانی ئەلبانیا (ئەنڤەر هۆکسا) کەتیتۆ هەمیشە دۆستایەتی و پەیوەندی لەگەڵ ئەودای بە (پەیوەنی برا گەورە )ناودەبرد وەلێ ئەم دۆستایەتیە تەمەنی درێژ نەبوو ،ئەمەیش وایکرد ئەلبانیا بەتەواوی لەڕوی پەیوەندیە نێودەولتیەکانەوە گۆشەگیر بێت و پتریش ببێتە جێگەی کاریگەری ڕۆژئاوا.

لەم کاتانەدا بیرۆکەی هاوکاری کردنی نەیارانی ستالین لەئەوروپای ڕۆژهەلات دا ،لەنێو حکومەتی ئەمریکادا گەشەی دەکرد،ئەمریکاییەکان پێیان وابوو هاوکاریکردنی دەولەت و گرووپە سەربەخۆکان لەستالین دەبێتە هۆی گۆڕینی ڕژێمە کۆمۆنیستیەکان لەسەرتاسەری ئەوروپادا،بە پشت بەستن بەم ڕوانینە ،سەرکردایەتی سوپای ئەمریکا یەکێك لەژەنەرالەکانی ناردە بارەگای (C.I.A)بۆئەوەی بەر پرسانی ئەم دەزگایە بخاتە ئەو بارو دۆخەوە کەلە ئەوروپادا سووپای تێدا دەژی ،هەروەها بۆ لێکۆلێنەوە لەمەسەلەی دابین کردنی زیاتری زانیاری نهێنی بۆی ..لەلایەکی ترەوە یەکێك لەکارمەندە پێشوەکانی (ن.خ.إ) بەناوی (ڕۆبەرت ماکرویل) توانی سەرکردایەتی سوپا دلنیا بکاتەوە کە زالدەستی ستالین لەئەوروپای ڕۆژهەلاتدا سەقامگیر نیەو بەلکو تارادەیەکی زۆر لاوازە ،(ماکرویل)پاش دانانی گریمانێك گەیشتە ئەم بەرەنجامە گریمانەکە دەبێژێت :تاچەندە سۆڤیەتیەکان توند تر دەست لەقورقوڕاگەی هاوپەیمانە شیوعیەکانیان بنێن ،هێندە بەرهەلستی سۆڤیەت لە ئەوروپای ڕۆژهەلات دا زیاتر دەبێت ..بەلەبر چاوگرتنی ئەم گریمانە سەرکردایەتی سوپا بیرۆکەکەی ماکرویل ی تەبەنی کردو دەستی کردە هاوکاری کردنی ئەوانەی کەلەستالین جیابوونەتەوە و بیرۆکەیەکی دیکەشی بۆ زیاد کرد کە پێی دادەگرت لەسەر هاوکاری کردنی جالیەی سەربەو دەولەتانەی لەستالین جیابوونەتەوە ،لەپێناوی پیادە کرنی ئەو پرۆسەیەی ناونرابوو (دوو بارە چکسازی کردنەوەی نیشتمان) لەئەنجامدا (C.I.A)ڕاسپاردەی سەرکردایەتی سوپای جێبەجێکرد و سەدان بەکرێ گیراوی خۆی ناردە پشتی بەربەستە ئاسنینەکەوە ،بەگومانی ئەوەی دەزگای هەوالگری سۆڤیەت ئامادەیی نیە بۆ ئەم جۆرە کردەوانە ،بەهۆی سەرقالیەوە بەقەیرانەکانی شەڕوو کاولکاریەوە ئەم بارو دۆخەش بەدلنیاییەوە باخی بووانی دژ بەستالینم لەئەوروپای ڕۆژهەلات دا سەردەخات ،بەلام بیردۆزەکەی ماکدویل لەهەلسەنگاندنی بارو دۆخی گشتی دا شکستی هێنا

،بەتایبەت ئەم بیردۆزە حاڵەتی شەکەتی ئەوروپیەکانی لەبەر چاو نەگرتبوو کەلـەماوەی جەنگ و ساتەکانی بوونی سۆڤیەت لـەسەر خاکەکەیاندا دووچاری ببوون .

سەبارەت بەئەلـبانیا هەندێك وایان دەزانی لایەنگرانی (زوگ)ی پادشای ئـەلبانیا کـە لـەقاهیرە بـەدوور خراوەیـی دەژیـا ،لـەناوخۆی ئـەلبانیا دا بـەهێزن وەك ڕابـردووش دڵسۆزن بۆی،لەهەمان کاتدا ناوەندە هەواڵدەریەکانی ڕۆژئاوا پێیان وابوو شـیوعیەکان بەڕابەرایەتی (هۆکسا)بەدەست چەندین گیروگرفتی گەورەوە دەنـاڵێنن بەتایبـەتی لـەو هەوالانەدا کەدەیدەن بۆ پاراستنی دەستەڵاتەکەیان لە ئـەلبانیادا. لەسـاڵی ١٩٤٧ دەوە دەزگـای هـەواڵدەری بـەریتانیا (M16)ژمارەیـەکی کـەمی پەرەشـووت دارەکـانی لەئەلبانیا دابەزاندبوو بەنیازی گرێدانی پـەیوەندی نـهێنی لەگـەڵ گرووپـە نـەیارەکانی شیوعیەت وەلێ پاراشووت دارەکان شکستیان هێنا لەهەڵنان و هـاندانی ئەوگروپانـەدا کەپێیان وابوو هاوکاریەکانی بەریتانیا بەس نیە بۆ هەستان بـە شۆڕشـێك یـاخود یـاخی بوونێك لەدژی شیوعیەکان ،ئەمە لەکاتێکدا بەریتانا بەدابەزاندنی پاراشووت دارەکـان دەسـتی هەڵنـەگرت بـەڵکو چـەند کـامپێکی کـردەوە بـۆ مەشـق پێکردنـی پەنابـەرە ئەلبانیەکان لەیۆنان و ئیتالیادا بەهۆی ئەم پەنابەرانەوە توانی چەندین جار هێرشی پارتی زانانەو سنور بەزاندن لـەسـەر سنووری ئـەلبانیا جێبـەجێبکات ،بـەڵام ئـەم کردەوانـە سەرەڕای دوبارە بوونەوەیان ئامانجەکانیان بەدەست نەهێنا .

لەلایەکی تـرەوە ڕۆژئـاوا بەلێبڕاویـەوە بیریـان کـردەوە لـەڕووخاندنی دەسـتەڵاتی شیوعیەکان ،پاش تێکچوونـی پەیوەندیـەکانی نێـوان (هۆکسـا)و هاوپـەیمانی پێشـووی (تیتۆ)نەخاسمە لەدوای ئەوەی هۆکسا هەستا بە لەکار لادانی وەزیری دەرەوەی (کوسی خوکسـیە)ی لایـەنگری یوگسـلافیەکان (جـی میـنـان)ی وەزیـری دەرەوەی فەرەنسـا لەوکاتەدا ئەم بارو دۆخەی ئەلبانیای بەم تەرزە وەسف کردبوو(لەئەلبانیا بارودۆخەکـە تراژیدیەو جەنگیش لەوێندەر چاوەڕوانی هەموان دەکات ).لەدوای ئـەوە واتـە لـەدوا لەرزینی وێنەی ڕژێمی کۆمۆنیستی لە ئەلبانیاو بەردەوامی شیوعیەکانی ئەلبان بۆچوونە

یۆنان بەمەستی هاوکاری کردنی هەڤاڵەکانیان لەشەڕی ناوخۆدا و هەروەها لەدوای گەشانەوەی ئەستێرەی بەختی پارتی کۆمۆنیستی ئیتالیا کەتەنها (٥٥)میل لەئەلبانیاوە دوورە لەدوای هەموو ئەوانە بەرپرسانی (C.I.A) بڕوایان بەبۆچوونەکەی دەزگای هەواڵگری بەریتانیا کرد بەتایبەتی لەهاوکاریکردنی لایەنگرانی (شازووگ) هەندێ لەپەنابەرە ئەلبانیەکان بۆ دووبارە داگیر کردنەوەی ئەلبانیا لەکۆتاییەکانی ساڵی(١٩٤٨) دا (ئێرنست بیڤن) ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا گلۆپی سەوزی هەڵکرد بۆ ئەنجام دانی کردەوەیەکی سەربازی سنووردار بۆ تێکدانی بارو دۆخ لەئەلبانیادا ..بەڵام لیژنەی (جەنگی سارد) لە بەریتانیا ڕۆژی (١٢/١٦)ی هەمان ساڵ

( بارەگای سەرەکی موخابەراتی سۆڤێتی لە گۆرەپانی " دز رجنسکی " لە مۆسکۆدا ، لەو جێگەدا زیندانی بەناوبانگی لۆبینکای تێدایە ، لۆبینکا چەندین کردەوەی گرتن و ئەشکەنجەدانی زیندانییە سیاسییەکانی لە یەکێتی سۆڤیەتدا بەخۆوە بینیوە ).

ڕایگەیاند پێویستە سەبارەت بە ڕەوشی ئەلبانیا مامەڵە لەگەڵ ئەمریکیەکاندا بکرێت..سەرەڕای ڕاڕایی هەڵوێستی ئەمریکیەکان سەبارەت بەم مەسەلەیە لەسەر ئەم بناغەیە دوو نێردراو لەنوسینگەی دەرەوەی بەریتانیا (ولیەم هاینەر)و (لۆرد جلیکۆ)سەردانی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایان کرد و لەگەڵ (فرنك وایزنر) لە(نوسینگەی تەنسیقی ڕامیاری)و (ڕۆبەرت جوسی) لەوەزارەتی دەرەوەی ئەمریکادا کۆبوونەوەیان کرد ...هەردوولا ڕێك کەوتن لەسەر دوور خستنەوەی ناوی هەردوو حکومەتی بەریتانیاو ئەمریکا لە هەر هەڵوێستێکی ئاشکرا سەبارەت بەکردەوەی سەربازی لەدژی ئەلبانیا سەبارەت بەشوناسنامەی گەریلاکانیش کەبڕیار وابوو مەشقیان پێبکرێت و کۆبکرێنەوە لەیەك دەستەی سیاسیدا هەردوولا یەك ڕابوون کەلایەنگرانی (شازوگ)وەهەندێك لەو محافیزکارانەی لەوولات هەڵهاتوون بڕبڕەی پشتی بزافی یاخی بوونی ئەلبانیا پێك دەهێنن شیاوی باسە ڕابەرانی شۆڕشگێڕانی ئەلبانیا بەم جۆرە پرش و بڵاو ببوونەوە لەمنفاکانیاندا:مەدحەت فراشی لەتورکیا بوو عەباس ئەرمەنجی لەیۆنان سعید کریوتز و عەباس کوبی لە ئیتالیا هەروەها ژمارەیەك لەپەنابەران لەمصر دا دەژیان بەسەر کردایەتی (مەلیك زوگ)...

لە(نیسانی ساڵی ١٩٤٩)دا(فرانك وایزنر)بەرەو (لەندەن) کەوتە ڕێ و بەمەستی تاوتوێکردنی مەسەلەی دۆزینەوەی بنکەیەك بۆ مەشق پێکردنی شۆڕشگێڕان لەسەرەتادا بنکەیەکی ئەمەریکا لەلیبیا بۆ ئەم مەبەستە دەست نیشان کرا وەلێ هۆکاری زۆر بوونە ڕێگر لەبەر دەم ئەم دەستی‌نیشان کردنەدا ئنجا ڕاکان سەقام گیر بوون لەسەر دەست نیشانکردنی دوورگەی (ماڵتا)ی ژێر دەستەڵاتی بەریتانیا وەك بنکەیەك بۆ مەشق پێکردنی شۆڕشگێڕان (وایزنر)سەبارەت بەهەڵبژاردنی دوورگەی (ماڵتا) گووتی (لەهەرکاتێکدا بێت دەتوانین لای بەریتانیەکان دوورگەیەك بدۆزینەوە تالێیەوە بۆ گۆڕینی ڕژێمی هەر دەوڵەتێك لەجیهاندا پێشڕەوی بکەین )... بەرلەوەی دەست بکرێت بە جێ بەجێ کردنی کردەوە سەربازیەکە لیژنە (بەریتانی - ئەمریکی)یەکە

تێبینی کرد کاتی ئەوە هاتووە یەکێك لەپیاوە سەربازیەکانی ئەمریکاش دیاریبکرێت بۆ سەرکردایەتی کردنی هەڵمەتە سەربازیەکە شان بەشانی بەریتانیەکان بۆ ئەو مەبەستە ژەنراڵ(رۆبەرت لۆ)دەستنیشان کرا کە ئەفسەرێکی یەدەگ بوو لەسوپای ئەمریکادا و خاوەنی شارەزاییەکی باشیش بوو لەکاروبارە سەربازیەکانی (بالکان)دا وەیەکێکیش بوو لەو پیاوە سەربازیانەی لەماوەی جەنگی جیهانی دووەم دا لە قاهیرە خزمەتیان کردبوو لەم ماوەیەی پلان ڕێژی کردن بۆ وەشاندنی گورزێکی سەربازی لەدژی ئەلبانیا هەموو پێش بینیە کان ئاماژەیان بۆ شکست هێنانی پلانەکە دەکرد بەتایبەتی کەپێك هاتەی شۆڕشگێڕان لەڕووی ڕامیاری و کۆمەڵایەتیەوە پیکهاتەیەکی ئاڵۆز بوو... لێك دابڕانی سیاسی تائەو کاتەش لەنێوانی هەندێك لەگرووپە شۆڕشگێڕەکاندا لەئارادا بوو تیرەو هۆزە باکووریەکان کە زووربەیان گاووری(ڕۆم کاسۆلیك)ن لەڕووی ڕۆشنبیری وشارستانیەوە بەتەواوی جیاوازن لەگەڵ هۆزە باشووریەکاندا کە موسوڵمانن ... هەروەها لەڕووی سیاسیەوە لایەنگرانی (مەلیك زوگ)ناکۆك بوون لەگەڵ شۆڕشگێڕانی (بەرەی بالی )داشیاوی باسەئەم بەرەیە بەسەرکردایەتی (عباس أرمنجی) لەماوەی دلێرانە لەدژی نازیەکان جەنگاوە... سەرەڕای ئەم ئاڵۆزیانە گرووپەکان توانیان دەستەیەکی نیشتمانی پێك بهێنن بۆ چوونە نێو جەنگەوە دەستەکە پێك هاتبوو لەدوو لیژنە یەکێکیان سەربازی بوو (عەباسیکووبی) سەرکردایەتی دەکرد وەك نوێنەری (مەلیك زوگ) هەریەك لە(عەباس أرمنجی) و (سعید کریوتزو)ش ئەندامی بوون لیژنەکەی دیکە رامیاری بوو ئەرکی سەرەکی بریتی بوو لەبرەو دان بە بیرۆکەی (ئەلبانیای ئازاد) ئەم لیژنەیە یەکێك لەڕابەرانی بەرەی (بالی) سەرۆکایەتی دەکرد بەناوی (مدحت فراشي) ... جگە لەوەش ئەم دەستەیە لەکارەکانیدا سەرکەوتو نەدەبوو گەر هاوکاری چەندین دبلۆماسی شارەزا لەکاروباری ئەلبانیادا نەبوایە بەتایبەتی لەدوای پێداگرتنی (شازوگ) لەسەر سەرۆکایەتیکردنی دەستەکە ... بۆ چەسپاندنی بینینی ئەم ڕۆڵە هەموو توانا و پاسەوانەکانی خستە خزمەتی (دەستەی

نیشتمانی)یەوە بەڵام دڵسۆزترین کەسەکانی هێشتەوە بۆ پاسەوانی کردنی ئەوبرە ئاڵتوونە یەدەگەی ئەلبانیا کەلە کۆشکی پاشادا هەبوو لەشاری قاهیرە ١٩٤٨/٧/١٤ یەکەم دەستەی پەنابەرە ئەلبانیەکان ڕەوانەی (ماڵتا کران )بەمەبستی ڕاهێنانیان ئەم کارە لەنهێنی یەکی زۆر گەورەدا بەڕێوە چوو سەرەڕای بڵاو بوونەوەی ژمارەیەکی زۆری بەریتانیەکان لەوێدا...(١٩٤٨/٩/٩) پاسەوانی ڕۆخەکانی ئیتالیا هاوڕێیەتی یەکەم گرووپی پەنابەرە ئەلبانیەکانی کرد کەلەسەر پشتی کەشتی (البحار الهائجة=دەریا هەڵچووەکان)بەرەو ئەلبانیا دەچوون لەدوای مەشق پێکرانیان پاسەوانە ئیتالیەکان زانیاری پێویستیان دەدایە (C.I.A)دەربارەی بەڕێوەچوونی کردەوەکان ... بەگەشتنی شۆڕشگێڕان بۆ ئەلبانیا لەمانگی (تشرینی یەکەم )دا(پۆلیسی نهێنی) ئەلبانیا کەئاگاداری پلانەکە بوو بۆسەی بۆدانان و دەستگیری کردن ... پلانەکەشی پوچەڵ کردەوە لەدوای ئەمە چەند نامەیەکی نهێنی گشتە بنکەی موخابەراتی بەریتانیا لە(کۆرفۆ)سەرچاوەی نامەکان ئامۆزای یەکێك لەو ئەفسەرە ئەلبانیانە بوو کەڕاسپێردرابوو بۆسازدانی کردەوەکە لەناو خۆدانامەکان باسی ئەوەیان دەکرد کەسێ کەس لەگەریلاکان لەبۆسەی پۆلیسی نهێنی دا کوژراون و ئەوانی دیکەش دەستگیر کراون (جیمس أنگلتون) کەهەر لەسەرەتاوە سەرپەرشتی کردەوەکەی دەکرد پێی وابوو موخابەراتی سۆڤیەت زانیاری دەست کەوتووە دەربارەی کردەوەکە لە هەندێك لەوپەنابەرە ئەلبانیانەوە کەلەڕۆژئاوا دەژین:لەم ڕایەشدا پشتی بەوزانیاریە کۆنانە دەبەست کەلەسەردەمی (فلیکس دجیر جنسکی) یەکەم دامەزرێنەری دەزگای هەواڵدەری سۆڤیەت لە ساڵی (١٩١٧ز) موخابەراتی سۆڤیەت هەستاوە بەدروست کردنی بەکرێگیراوی خۆی لەڕیزی نەیارانی سۆڤیەت دا بەهەرحاڵ شۆڕشگێڕانی ئەلبان لەدوورگەی ماڵتاوە بەردەوام بوون لەسەر چەند بارە کردنەوەی هەوڵە سەربازیەکانیان بەنیازی تێکدانی بارودۆخ لەئەلبانیا وەلێ بەهیچ شێوەیەك بەخت یاوەریان نەبوو بەڵکو یاوەری هێزەکانی ئاسایشی ئەلبانیا بوو کەهەمیشە زانیاری پێش

وەختیان هەبوو سەبارەت بەوەی ڕوو دەدات لەلایەنی خۆیانەوە ئەمریکیەکان بەو بەرنجامە دەستیان هەڵنەگرت ئەوەبوو(مایکل بیرك)ی نوێنەری (ن.ت.ر) و ڕاسپێردراو بۆکارکردن لەگەڵ بەریتانیەکاندا هەستا بەگواستنەوەی بنکەکەی خۆی بۆ (ڕۆما)بەمەبەستی چاودێری کردنی دووبارە کۆکردنەوەی شۆڕشگێڕانی ئەلبان هەروەها کۆمپانیایەکی وەهمیشی دامەزران بەناوی کۆمپانیای (فلیمه کەشخەکان)بۆ ڕووپۆش کردنی کردەوە هەواڵدەریەکانی ... ئەوماوەیە ڕێگە نەدرا بە (بیرك) سەردانی (مالتا )بکات شیاوی باسە (بیرك) لەسەردەمی جەنگی دووەمی جیهانی دا کارمەنی (ن.خ.إ) بووە لەلایەن(فرنك لیندزی)بەڕێوەبەری نوسینگەی تەنسیق بۆکاروباری ئەوروپا وە کراوەتە نوێنەری (ن.ت.ر) لە ئەڵمانیای ڕۆژئاواوە (جان ماکلۆ)ی نوێنەری باڵای ئەمریکا پێشنیارێکی پێشکەش کرد کەلە (C.I.A) ەوە پێی ڕاگەیەنرابوو باسی لەمەشق پێکردنی شۆڕشگێڕانی ئەلبانیا دەکرد لەئەڵمانیادا.. لەژێر پەردەی کۆمپانیایەکی وەهمی دا کەپاشتر ناونرا (کۆمپانیای ٤٠٠٠) ئەم کۆمپانیایە شان بەشانی هەندێك لەئەفسەرە ئەمریکیەکان (٢٥٠) پەنابەری ئەلبانیشی لەخۆ گرتبوو کەلەنێویاندا هەندێك لەو بەر پرسانەی تێدابوو کەڕاسپێردرابوون ئەرکی سەرکردایەتی پرۆسەی ڕاهێنانەکە بگرنە ئەستۆ.. لەلایەکی ترەوە (مایکل بیرك) کەئەو دەم لە ئەوروپابوو ڕاستپێردرا کە جێگەیەکی گونجاو بدۆزێتەوە بۆ کارکردنی ئەم کۆمپانیایە لە ئەڵمانیادا ئەوەبوو (بیرك) توانی جێگەیەك بدۆزێتەوە تاوەکو ببێتە بنکەی گەریلا ئەلبانیەکان ناوچەکە ناوی (شلوس) بوو دەکەوتە سەر لێواری ڕووباری (نیکر) لەدەوروبەری ناوچەی (هاید لبرگ) دا سەرەڕای هەڵگرتنی ئەم هەنگاوە پۆزەتیفانە لە سەرە ڕێگەی دووبارە کۆکردنەوەی شۆڕشگێڕانی ئەلباندا کەچی شیکاریەکانی تایبەت بە (C.I.A)هەندێك ڕاڕایی نیشان دەدات سەبارەت بەوەرگرتنی هەڵوێستی گونجاو لەمەڕ ئەلبانیا ئەوەبوو یەکێتی سۆڤیەت سەرکەوتنی بەدەست هێنا لەتەقاندنەوەی یەکەم بۆمبی ئەتۆمی لە (ئەیلول-١٩٤٩ز) دا ئەمەش

لایەنگرانی (شەڕی سارد)ی هاندا تـاکو فشـار بخەنـە سـەر کۆشـکی سپی بۆئـەوەی بـەردەوام بێـت لـەسـەر شـلەژاندنی بـارودۆخی نـاوخۆی ئـەلبانیا ،هـەروەها بەشـە رەسمیەکانی ئیدارەی ئەمریکا زانیاری و هـەواڵی پێچەوانـەیان پێدەگەیشـت دەربـارەی باروو دۆخی (هۆکسا)و هاوەڵە کۆمۆنیستەکانی لەئەلبانیادا.

جگە لەو دوو هۆکارە هۆکـارێکی تریـش لـەئارادابوو کـەبریتی بـوو لـەبارودۆخی بەهێزی ستالین ،ئەم فاکتەرەی سێ یەم هەندێ لەپیاوە ژیرەکانی کۆشکی سـپی هـاندا تـاکو دووبـارە چـاو بگێڕنـەوە بەپێشـنیارە منداڵانـەکانی (ن.ت.ر) دا.وەلێ ئـەم دڵـە ڕاوکێو پرسیارو پرسـیارۆکانە نـەدەدران بـەگوێی ئـەو شۆڕشـگێڕە سـاکارانەدا !! کەبەردەوام بوون لەسەر مەشق کردن لەسەردەستی موخابەراتەکانی ڕۆژئاوادا ...

لەلایەنی خۆیەوە (ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی )ڕاپۆرتێکی بەرزکردەوە تیایدا هاتبوو (سەرەڕای بارودۆخە نارەحەتەکان،پێویستە لەسەر وولاتە یەکگرتووەکان بـەردەوامێتی بـدات بـەهاوکاری کردنـی کـردەوە سـەربازی و شـالاوە ئیعلامیـەکانی دژ بەکۆمۆنیزم،بەئامانجی پارێزگاری کردن لەو ترووسـکە هیوایـەی کـە پێـی وایـە هـێزە ناشـیوعیەکان لەوولاتـە دۆسـتەکانی یـەکێتی سـۆڤیەت دا سـەردەکەون ،گەرووڵاتـە یەکگرتووەکان دەستبەرداری ئەوکردەوانە ببێت،ئەوا یانی دەست بـەرداری ئـەو بنـەما بناغەییانە بووە کەڕابەرایەتی ئەمریکا بۆ جیهانی ئازادی لەسەر ڕاوەستاوە)...

لەگەڵ سـەرەتای سـالی (١٩٥٠ز )دا ،ڕای گشـتی ئـەمریکی قەلـسی دەردەبـڕی بەرامبەر هەژموونی سۆڤیەت بەسەر بارو دۆخی نێو دەوڵەتیدا ،و دەستەوسانی ئیدارەی ئەمریکا تارادەیەکی زۆر لە پاراستنی هاوسەنگی نێوان دوو زل هێزەکـە ... (سـیناتۆر جومکارش) توانی ڕای گشتی ئەمریکا لەدژی سیاسـەتەکانی کۆشـکی سـپی هـانبدات ،لـەمیانەی تۆمەت بارکردنی چەند پاتکراوەوە کەئاڕاستەی (٨١) کارمەندی وەزارەتـی دەرەوەی دەکردو بەنا دڵسۆزی بۆ وولاتەکەیان دابوو لەقەڵـەم و ئاماژەشـی بـەبوونی ئەندامی بەبیرورا شیوعی دەکرد لەنێو حکومەتی ئـەمریکادا... یـەکێك لەوکەسـانەی

بەرشالاوی تۆمەت بارکرانەکە کەوتن ،(دین ئەکنسون)ی گەورە کارمەندی وەزارەتی دەرەوەو کۆنە هاوەڵی سیخوڕی سۆڤیەتی (ئەلگەر هیس) بوو ...

لەژێر فشاری ڕای گشتی و تۆمەت بارکردنەکانی (مکارش) دا ،لیژنەیەك پێکهێنرا لە(لیژنەی لێکۆڵینەوەکانی سەر بەئەنجوومەنی پیران )و لیژنە پێکهاتوەکە دەستی کرد بەلێکۆڵینەوە سەرەتاییەکانی لەگەڵ هەندێ لەکارمەندە رەسمیەکاندا نێچیرەکە پاریزراو بوو سەگی ڕاویش بەردەوام دەوەڕین لەبەر تینویەتیان بەخوێن سەگی ڕاو لەوکاتەدا بریتی بوو لەبەشی هەرە زۆری گەلی ئەمریکی (دەربڕینی دانەرە)وەرگێڕی کوردی کەکەوتبوویە شوێن تۆمەتبارکردنەکانی پیاوێك کە هەرگیز خۆش ویستراو نەبووە، واتە (مکارش)... ڕای گشتی (C.I.A) و (ن.ت.ر) هاندا بۆئەوەی پەلە بکەن لەوەشاندنی گورزی سەربازی لەئەلبانیا.

لەوماوەیەدا پەنابەرە ئەلبانیەکان بەباشی ڕاهێنانەکەیان بەرێ دەکرد .جگە لەهەندێ گیرو گرفتی ڕامیاری بچووك کەکات ناکاتێ لەنێوان لایەنگرانی (پادشا زوگ)و نەیارەکانیدا سەری هەڵدەدا ...

گەریلاکانی ئەلبان لە (مالطا) چەند هەوڵێکیان دا بۆ پێشرەوی کردن بەرەو سنوورەکانی ئەلبانیا لەڕێگەی (یۆنان) ەوە بەمەبەستی ئەنجامدانی شالاوی سەربازی ..بەلام پۆلیسی یۆنانی سەرجەمیانی دەستگیر کرد ،پاش ئەوەی بۆیۆنانیەکان ڕوون بوویەوە کەبەریتانیەکان بەووردی ئامانجەکانی کردەوە سەربازیەکان و شێوازی جێبەجێ کردنەکەیان بۆ حکومەتی یۆنان ڕوون نەکردۆتەوە ،بەم پێودانگە ئەنجام دانی کردەوە سەربازیەکانی ڕاوەستاند بۆ ئەوەی خۆ لەکاردانەوی ڕابەری ئەلبانی لەناوخۆدا دوور بخاتەوە .. لەئەنجامدا، حکومەتی یۆنان شۆڕشگێڕە ئەلبانیە دەستگیرکراوەکانی مەرەخەس کردو گواستنیەوە بۆ جێگەیەکی نهێنی بۆ ئەوەی پەردەپۆشی مەسەلەکە بکات ... لەکاتێکی دواتردا ،شۆڕشگێڕان هێرشیان کردە سەر سنوورەکانی ئەلبانیا و تارادەیەك سەرکەوتن لەبەزاندنی هیلەکانی بەرگری شیوعیەکانی ئەلبانیا دا ،بەلام

نەیان توانی یەکبینە بن لەپێشڕەوی کردندا ،بەهۆی ئەو زیانە زۆرەی لەژمارەی کەمی شۆڕشگێڕان کەوتبوو ...

لەدوایدا ئەوانەی دەرباز بوون لەچالاکیەکە ،گەڕانەوە کامپەکانی ڕاهێنان و بیرو ڕای خۆیان سەبارەت بە بارودۆخی گۆڕەپانی جەنگ بۆ بەرپرسان ڕوون کردەوە ،دووپاتیشیان دەکردەوە کەئەستەمە بەم ژمارە کەمەوە هێڵەکانی بەرگری ئەلبانیا بەتەواوی تێك بشکێنرێت نەخاسمە لەم کاتەشدا کەهەمووان بڕوایان وایە کەدەزگای هەواڵگری ئەلبانیا زانیاری پێش وەختی هەیە ،لەسەر هەموو چالاکیە سەربازیەکان و ئەو هەنگاوە سەربازیانەی لەلایەن شۆڕشگێڕانەوە دەگیرێنە بەر ...بەرەنجامی زیانە مرۆییەکان و هەوڵە شکست خواردووەکان ،شۆڕشگێڕان هەستیان بەحەتمیەتی شکستی ئەرکەنیشتمانیەکەیان دەکرد ...وگومان و دوودڵیش دزەی دەکردە ناخی ڕاهێنەر و بەرپرسە ئەلبانیەکان لە ڕیزی شۆڕشگێڕاندا ...ئایە ئامانج لەدووبارە کردنەوەی ئەم جۆرە چالاکیانە تەنها مەرامی و ماستاو کردنە بۆ بەرپرسان لە(M16) بردوای و سەرانی (C.I.A)و (ن.ت.ر) لەواشنتن؟ گەر وەڵیمەکە ئەرێ بێت پرسیارێکی تر سەرهەڵئەدا کەزۆر لەوە قورسترە وەڵام بدرێتەوە پرسیارەکە تاهەتایە لەسەرزاری ویژدانی مرۆدا دەمێنێتەوە کەدەڵێت(ئایا مەرامی کردن بۆ سەرانی (C.I.A) و(M16) تاوانێك نەبوو کەزۆرێك ڕۆحی بێگەردی بویە قوربانی؟)...

لەنێوەندی ئەم دوو پرسیارەدا ڕاستیەك لای شۆڕشگێڕانی ئەلبانیا خۆی قوت دەکردەوە کە دەڵێت :- (ئەزمونەکەی لەمەڕ ئەلبانیا ،بەتەنها بریتیە لەئەزموونی ململانێی نێوان (C.I.A)و(M16) لەسەر هەژمونداریێتی و زاڵبون لەئەورووپادا).

ساڵی ١٩٥٠ ،پیاوانی (M16) هەستیان بەتەنگ دەستی دارایی دەکرد بەهۆی پاشەکشێی ئابووری بەریتانیاوە ،لەکاتێکا (C.I.A) و(ن.ت.ر) هەستیان بەهیچ نەکرد جگە لێشاوی ماددە ... لەم ڕووەشەوە ،دەزگای (M16) کەوتە ژێر

کاریگـەری پێشـکەوتنی تەکنـەلۆژی ئـەمریکاوە کـەتا ڕادەیـەکی زۆر بوویـە هـۆی سەرکەوتنی (C.I.A)لەبواری سیخوریدا .

لـەهەمان ساڵدا (فرنك وایزنر)ی سەرۆکی (ن.ت.ر) پیاوێکی شارەزای لـەکاروباری (بالکان)دا هەڵبژارد بەناوی (گراتیان یاسیڤیتش) هەردووزمانیصربی و کرواتیدەزانی و بەباشی پێیان دەدوا ،پێشتر لـەگەڵ سیخوری بەریتانی (کیم فیلبی)دا کـاری کردبـوو بۆسـازاندنی هـەل ومـەرجی هاریکـاری لـەنێوان ئـەمریکاو بـەریتانیادا ..لـەسـەرەتای حوزەیرانی هەمان ساڵدا ،هێزە شیوعیەکانی کۆریای باکوور توانیان هەندێك ناوچـەی کۆریای باشوور داگیر بکەن ،ئەم حاڵەش بوویە بەڵگـە بەدەسـتی ئەمریکیەکانـەوە بـۆ پاساودانی کردەوە سەربازیەکانیان لەئەلبانیادا ،بۆیە بڕیاریـان دا لـەسـەرپلانی گۆڕینـی ڕژێمی ئەلبانیا بەردەوام بـن ،وەلێ ئـەم پرسـیارەی ئامـادەگی هەمیشـەی هـەبوو ،ئـەم پرسیارە بوو :باشترین ئامراز کامەیە بۆ گەیاندنی گەریلاکان بەناو جەرگەی ئەلبانیا؟..

وەلامـی پرسـیارەکە ئـەم جارەیـان لـە (جـەو) دوە هـات ،(ن.ت.ر) پێـی وابـوو گواسـتنەوەی شۆڕشـگێڕەکان بۆنـاو جەرگـەی ئـەلبانیا لەرێگـەی ئاسمانیـەوە (واتـە بەفڕۆکە)،ڕێگەیەکی لەبارەو ئەمریکا دووچاری تۆمەتبار کردن بەپێشل کردنی یاسا نێو دەولـەتیەکان ناکاتـەوە .. لەلایـەکی تـرەوە...بەرپرسـانی (M16) ش بیرۆکەکـەیان بەگونجاو زانی ..نەخاسمە لەبەریتانیا کۆمەڵێك فرۆکـەوانی پۆلـۆنـی هەیـە کەلەجـەنگی جیهانی دووەم دا لـەدژی ئەڵمانیەکان جەنگاون و لـەشەڕە ئاسمانیەکاندا چاپوکیەکی بێ وێنەیان نیشان دابوو – لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بدرێت بەوەی ئەم فرۆکەوانانە ناچار کرابوون کەبسوولی کیمیاء ی ژەهراوی (سـیانید)هـەڵبگرن بۆئـەوەی لـەکاتی بـەدیل گیرانیاندا قووتی بدەن .

لـەپاش دا ،ڕاهێنـانی چڕ بۆفڕۆکەوانـە خۆبەخشـەکان لـە هیـدل بـرگ سـازدرا ،لەبەرێکرانی ئەم ڕاهێنانانەدا هەردوو ڕابەری ئـەلبانی (کوبـی و ئـیرمنجی) زۆر جـار ئامـادە دەبـوون و دلّـە ڕاوکـێ و ترسـی خۆیـان دەردەبڕی بەرامبـەر ئـەم پرۆسـە

هەوایيه.ئەوه بوو پێشبينيەكانيان ڕاست دەرچوو ،بەوەی يەكەم هەوڵی بەكارهێنانی فڕگەی يۆنان شكستی هێنا چونكه يەكێكيان بەرلە فڕينی فڕۆكەكان پلانەكەی تێكدا ... ئيدی (١٦ فڕۆكەوانە تەرخانكراوەكەيان)گەڕاندەوە بۆئەلمانيا.

( هەندێك لە ئامێرە سيخوڕيە ئەمريكيەكان كە موخابەراتی تيشكی دەستی بەسەردا گرتوون ، ئەم كامێرانە و ئامێرەكانی تريش كە( C.I.A) بەكاری دەهێنان بۆ سيخوڕی كردن بەسەر مۆڵگە سەربازيەكانەوە لە ئەورووپای ڕۆژهەلاتدا دەخرانە نێو ئەو بالۆنانەوە كە بۆ مەبەستی كەشناسی هەڵدەدران و لە بەرزيەكی زۆرەوە وێنەی مۆڵگەكانيان دەگرت ) .

كەئەركی جێبەجێكردنی ئەم كارەيان لەئەستۆ دابوو ...كەتۆپەكە گەڕێنرايەوە ،نۆ فڕۆكەوان بەئەستەم توانيان هێزی تايبەتی سەر بەشۆڕشگێڕانی ئەلبانيا لەناو جەرگەی ئەلبانيادا دابەزێنن ،بەڵام پۆليسی نهێنی ئەلبانيا لەبۆسەدا بوو بۆيان ،توانی هەموو پارەشووت دارەكان بگرێت جگە لەدوانيان كەتوانيان هەڵبێن بۆ يوگسلافيا ...

وەك كاردانەوەيەك لەسەر ڕاكردنی ئەو دووپياوە ،پۆليسی ئەلبانيا خێزانی يەكێكيانی كوشت (واتە خێزانی (ئادەم جيرا)ی كوشت (ئادەم جيراش)لە يوگسلافيا بۆماوەی ١٩ ساڵ زيندانی كرا )لەماوەی ساڵی يەكەمی زيندانی كرانەكەيدا ،هەوڵی دەدا

بەرپرس و ڕابەرە ئەلبانیەکان وەئاگابێنێتەوە لەمەترسی ڕەوشەکە ،وەلێ نەیدەزانی ئایە ;ئاگادارکردنەوەکانی دەگاتە گوێی بەرپرسان یاخود نا؟ سەرەڕای شکستە ئاشکراکەی ، کەچی (ن.ت.ر) بەردەوام بوو لەسەر بەسەرباز کردنی پەنابەرە ئەلبانیەکان و ناردنی دارایی بۆ کامپەکانیان لەرێگای ڕۆماوە...

لەحوزەیرانی ١٩٥١ یشدا ، دابەزاندنی ١٦ شۆڕشگێڕی تر لەئەلبانیادا هەمان چارە نووسی بەرکەوت ،ئەوی لەجێگەی دابەزاندنەکەدا کوژرا ئەکوژراو ئەوانی تریشیان لەدوای دادگای کردنی ئاشکرایان لەشاری تیرانای پایتەخت بەتۆمەتی ناپاکی هەرە گەورە بەرانبەر ئەلبانیا ، لەسێدارە دران .لەدوای ئەم زنجیرە ڕوداوە پەنابەرەکان هەموو ئومێدێکی سەرکەوتنیان لەدەست دا ، ئاستی هەستی نیشتمانیش لای پەنابەرە بەسەربازکراوەکان داڕووخا ،ئەوانەیان کەلەدەوری نەیاران یاخوود لایەنگرانی (پادشا زوگ)دا خر ببونەوە .. لەلایەکی ترەوە بەریتانیەکان هەولیاندا گرووپێکی تر لەپەنابەران لەسەرزەویەکانی (دراتموور)ی بەریتانیا مەشق پێبکات ، بەلام هەولەکە شکستی هێنا بەهۆی ناکارامەیی دەستە بەسەربازکراوە نوێیەکەوە .

بەکۆتای هاتنی ئەم ئەزموونەی ،بەریتانیا دۆسیەی ئەلبانیای داخست و بڕیاری دا کاروباری ئەلبانیا بەتەنها جێبهێلێت بۆ ئەمریکا تاکو بەئارەزووی خۆی بڕیاری گونجاوی لەبارەوە بدات ،ئەمریکا لەلایەنی خۆیەوە هیوا بڕاو نەبوو بەسەرکەوتنی شۆڕشگێڕانی ئەلبانیا ،بەتایبەت لەدوای درەوشانەوەی ئەستێرەی سەرکردە (حامیت ماتجانی)کەبەتوانای خۆی سەلماندبوو لەهەلگرتنی نارەحەتی و ئەرکە قورسەکان دا ... ئەوە بوو لەژێر چاودێری (C.I.A)دا لەدورگەی (کالابیسیا)ی یۆنانی لەسالی ١٩٥٣ دا کۆمەلێك لەئەلبانیە ئازاو چاونەترسەکان لەگەل سەرکردە (ماتجانی)دا ڕاهێنانیان دەستپێکرد..بڕیاری بەردەوامی دانیان بەڕوتەکەدا ... ئەمەش وای کرد (مەلیك زوگ) کۆمەلێك لەپیاوەکانی ڕەوانە بکات تاکو شان بەشانی (ماتجانی )مەشق

بکەن .لەم قۆناغەدا ،هەندێك واگومانیان دەبرد کەرژێمی (هۆکسا)دەستی بە داروخان کردووە لەبەر دووهۆ:

١-ژمارەیەك لەشۆڕشگێڕان توانیویانە بچنە ناو جەرگەی ئەلبانیاوە ،وتۆرێکی پەیوەندیشیان لەنێوان ناوەو دەرەوەدا رێکخستووە .

٢-مردنی ستالین لە (١٩٥٣/٣/٥ز)دا...وەلێ ئەم ئەگەرەش بێ هوودەو پوچ دەرچوو ،لەدوای ئەوەی لەشەوی سەری ساڵی ١٩٥٣ دا ڕادیۆی ئەلبانیا ڕایگەیاند زۆرێك لەو ئەلبانیانەی لەماوەی دووساڵی ڕابردودا داەبەزێنراونەتە ئەلبانیاوە لەسەر دەستی (C.I.A)دا ئێستا لەزیندانەکانی ئەلبانیادان ،بە(حامیت ماتجانی) یشەوە ، کەلەسەرەتای یەکەم ئەرکی سەربازیدا دەستگیر کراوە . بەم ڕاگەیاندنە ،ئەمریکیەکان لایان ئاشکرابوو ،کەلەماوەی دوو ساڵی ڕابردوودا موخابەراتی ئەلبانیا خەڵەتاندوونی و وای لە ئەمریکیەکان گەیاندووە کەتۆڕی پەیوەندیە ناوخۆی و دەرەکیەکە تۆڕێکی ڕاستەقینەیە !.

بەڵام بۆچی هەموو هەوڵەکان بۆ ڕوخاندنی (هۆکسا) شکستیان هێنا ؟وەڵامەکانی ئەم پرسیارە زۆرن و فاکتەرەکانیش هەمە چەشنن. پسپۆڕانی سیخوری شێوە یەك دەنگن لەسەر ئەوەی (کیم فیلبی) پیاوی سۆڤیەت لە (M16)دا هۆکاری یەکەمین بووە لە (فڕوفێڵەکەی ئەلبانیا)دا ،بەرلەوەی نهێنیەکەی ئاشکرا ببێت (کیم فیلبی)ڕایکردە یەکێتی سۆڤیەت و پاشماوەی تەمەنی لەوێندەر گوزەراند.

شیاوی باسە لەساڵی ١٩٤٩دا فیلبی لای زۆرینەی ناسراوەکانی ،پیاوێکی ڕۆشنبیر و ،زیرەك و ،دڵسۆز و خۆشەویست بووە لای زۆربەی هاوڕێکانی ... بەڕاستیش فیلبی خاوەنی ئە خەسڵەتە باشانە کەکوڕی یەکێك لەسیاسەت مەدارە ناسراوەکانی بەریتانیاش بوو ،توانی بگاتە پۆست و ناوەندە ئاڵۆزو گرنگەکانی (M16) ،چەندین جار نوێنەری (M16)بووە لەووڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو بەشداری کردووە لە چاودێری کردنی و سەرپەرشتی کردنی مەشقی شۆڕشگێڕە ئەلبانیەکاندا بەڵام

(رۆبەرت لۆ)گوومانی هەبوو لـەوەی (فیلبـی )زانیـاری دزە پێبکـات لـەبـەرژەوەندی سۆڤیەتیەکان کەچی ئەم تۆمەتانەی بۆ نەسـەلما ...هەرچـەندە لەوکاتـەدا ووتـی : (زۆر ئاشکرایە کـە هـەواڵ دزە دەکـات بـۆ ئەلبانیـەکان .. شـیوعیەکان زۆریکـی زۆریـن دەزانن..)بەرپرسانی (C.I.A)داوایان کرد کە (کیم فیلبی)بەپەلە بگەڕێتوە بۆ لـنـدن لەدوای هەڵهاتنی دووبەکرێگیراوی (M16)بۆ یەکێتی سۆڤیەت..

شیاوی باسە ،بەڕێوەبەری (C.I.A)لە تشرینی یەکەمی ١٩٥١ ەوە گوومانی پەیدا کردبوو بەرامبەر ئەو ڕۆڵە پەنامەکیەی (کیم فیلبی)دەیبینێت ، بۆیە هەڕەشـەی کۆتـایی هێنان بەپەیوەندیە بەتینـەکانی نێـوان (C.I.A)و(M16) ی کـرد گـەربێت وئـەم دەزگای دووەمە هەڵنەسێت بەگۆشەگیرکردنی (فیلبی)وگواستنەوەی لە (واشنطن)...

(فیلـبی)دەربـارەی ڕۆژەکـانی ژیـانی لـە (واشـنطن) دا دەڵێـت (چـەند ژمـارەی ناسراوەکانم و ئەوانەی سـەردانیان دەکـردم لـە (واشـنطن) زیـادی بکردایـە ،ئـەوندە زانیاری لەمەلەفەکەم دا زیادی دەکرد... منیش تەنـها لەڕاسـتیدا ئـەوەم مەبەسـتبوو) لەڕاستی دا (فیلبی) دانی نەناوە بەڕۆڵی دووڕوانە گێڕاندا لە (فڕوفێڵەکەی ئـەلبانیا)دا ..وەلێ گەر بێت و پۆستەکەی فیلبی و پەیوەندیە ئالۆزەکانی لە (واشنطن)، لەلایـەك و ڕاکردنە ئابڕوبەرانەکەی بۆ یەکێتی سۆڤیەت لەلایەکی ترەوە هەروەها برِو جـۆری ئـەو زانیاریانەی پۆلیسی ئەلبانی لێی ئاگادار بوو پێکەوە ببەستینەوە ... ئەوا بەرەنجامێکمان دەستگیر دەبێت کەفیلبی بەرپرسە لەکوژرانی پتر لە (٣٠٠) کەس کەلەنێویاندا منـداڵ و ئـافرەت هـەبووە لـــەماوەی جـەنگی ئـەلبانیادا ... بەهـەرحاڵ ماوەتـەوەبێژین جەماعەتـەکانی (دەربڕیـی دەقـاو دەقـی نوسـەرە وەرگـێڕی کـوردی) (C.I.A)و (M16) هۆکاری پشتەوەی شکستی ئەرکی شۆڕشگێڕانی ئەلبانیا بـوو ... بۆنموونـە بۆچی هـەردوو دەزگاکـە دوا کـەوتن لـەخـەملاندنی حەتمیـەتی شکسـتی پرۆسـەکەی ئەلبانیا؟ سـەبارەت بـەم بابەتـە بەڕێوەبـەری (ن.ت.ر) بۆکاروبارەکـانی ئـەوروپا لـەو قۆناغەدا دەڵێت : (یەکبینە بوون لەسەربڕینی خەڵك لەبەشی کۆتایی جەنگی ئـەلبانیادا

،كـاريكى نارەوشـتى و كەرانـە بـوو لـەهـەمان كـاتدا )بێگوومـان كـارتى قصابـەكان نەدەگەيشتنە ملـــى پيـاوانى (C.I.A)و (M16) بـەڵكو بەتەنـها دەگەيشـتە ملـى پەنابەرە ئەلبانيەكان ،كەبوونە قوربانى ئەوانەى پيلانيان دادەناو زانياريان كۆدەكـردەوە لەنوسينگە سيخورپەكاندا ... گەر (كيم فيلبى)ناپاك بووبێت ئەوا هەرگيز (C.I.A) و (M16) بێتاوان نين .

## بەشي سێیەم

# ﴿ جەنگی زانیاریەکان ﴾

لەپەنجاکانەوە تائەم کاتەی ئێستامان دەزگاکانی هەواڵدەری ئەمریکا و سۆڤیەت هەموو هەوڵ و توانایەکیان خستۆتە کار لەپێناوی قایل کردنی وولاتەکانیان بەزەرورەتی هێشتنەوەی چالاکی سیخوڕی و یارمەتی دانی بەهەموو ئامرازێك مادامێك دوژمن لەبەرەی بەرامبەردا مابێت... بەپێی ئەم هەولانە بەرپرسانی (C.I.A)و(K.G.B) (واتە موخابەراتی سۆڤیەت )هەموو هەولێکیان بەگەڕخستووە بۆ دەرخستنی ئەو دەست کەوتانەی لە هەولە سیخوڕیەکاندا بەدەستیان هێناوەو ئەو ڕۆلە کاریگەرەی دامەزراوە تەنزیمی و ئیداریەکانیان بینیویانە لەدوای ئەوەی سالی ١٩٥٠ز (ولتر سیمث) لەدوای (ئەمیراڵ هیلۆن کوتر) کرایە بەڕێوەبەری (C.I.A) ،(سیمث)چەکوشکاریەکەی پەیکەری ڕێکخستنی (C.I.A)ی کرد بۆ ئەوەی سەرنجی بەرپرسەکانی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت لەم ڕووەوە سێ بەڕێوەبەرایەتی نوێی پێکهێنا بەم تەرزە:

١-لەئەنجامی خستنە پالیەکی (ن.ت.ر) و(نوسینگەی کردەوە تایبەتیەکان) بەڕێوەبەرایەتیەکی نوێی بەناوی(بەڕێوەبەرایەتی پلان دانان)پێکهێنا،(ئالن دالس)کرایە بەڕێوەبەری (فرنك وزنر)یش جێگری بەڕێوەبەر(ریشارد هلمز)پۆستی بەرپرسی کردەوەکانی پێسپێردرا .

٢-بەڕێوەبەرایەتی (زانیاریەکان)چەند نوسینگەیەکی هەبوو کە (C.I.A)یان بەزانیاری پێویست پشت ئەستوور دەکرد و لەڕووی نیشتمانی و ئیعلامیەوە

هاریکاریان دەکرد ...دیارترین نوسینگەکانی سەر بەم بەڕێوەبەرایەتی‌یە بریتی بوون لـە :

- نوسینگەی خەملاندنی نیشتمانی.
- نوسینگەی زانیاریە زانستی یەکان.
- نوسینگەی زانیاریە ئالوگۆڕپێکراوەکان .

٣-بەڕێوەبەرایەتی (پشتگیری)لەپاشـدا نـاونرا بەڕێوەبەرایـەتی (بـەڕێوەبردن)ئـەرکی سەرەکی بریتی بوو لـە ڕێکخستنی کاروباری دارایی و شتو مەك ...بەرلەکۆتایی هاتنی سـاڵی ١٩٥٢ ژمـارەی کارمـەندانی (C.I.A)گەیشـتە (١٠,٠٠٠)کارمـەند . وەبودجەکەشـی بـەڕەسمی دیـاری نـەدەکرا سـاڵی ١٩٥٣ز یـش سـەرۆك (ئایزنهاوەر)،ژەنەراڵ(سیمث) ی کردە بەرپرس لە ئیدارە نوێ یەکەی خۆیـدا و (ئـالن دالس)ی شـی کـردە بەڕێوەبـەری گشـتی لـە (C.I.A)دا هـەروەك چـۆن (جـۆن دالـس)ی براشـی کـردە وەزیـری دەرەوەی ئـەمریکا. شـیاوی ئامـاژە پێدانـە (ئـالن داس)سەرەتای کاری موخابەراتیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ جەنگی جیهانی یەکەم لـەقۆناغی جەنگی جیـهانی دووەمیـش دا پـەیوەندی بـە (ن.خ.إ) وە کـرد هێنـدە لەڕاپـەڕاندنی کارەکانیدا وورد و زیرەك و کارامە بووە هەندێك لەهاوەڵـەکانی ناویـان نـابوو فیلـە سپیەکە .دیارە فیلـی سـپی ناسـراوە بـەزیرەکی یـەکی زۆر .لەیەکـەم هـەنگاویدا بـۆ لەگۆڕنانی فراوان خوازیەکانی سۆڤیەت و کۆنترۆڵ کردنی هەوڵەکانی شیوعیەت لـەم پێناوەدا ،(دالـس)بەهەماهەنگی لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی پلان دانانی (C.I.A)دا هەسـتا بەدامەزراندی (ڕادیۆی ئـازادی)و (ڕادیـۆی ئـەوروپای ئـازاد)کـە پرۆگرامـەکانی لـە ئەڵمانیای ڕۆژئاواوە پەخش دەکرد... وسالآنە ٣٠ ملیۆن دۆلار خەرجی دەخستە سەر (C.I.A)...برێك لەو پارەیە تەرخان کرا بۆ ئەو ڕۆشنبیرو کارمەندە ئیسـتگەییانەی لەڕادیۆکەدا کاریان دەکرد و خەڵکی ئەڵمانیای ڕۆژهەلات بوون.

هەروەها (دالس)پێی دادەگرت لەسەر پەخشکردنی پرۆگرامی ئاینی بۆ ئەوروپای ڕۆژهەڵات وەك ئەلتەرناتیفی ئەو کردەوە تێکدەریانەی پێشتر (C.I.A)جێبەجێ‌ی دەکردن لەوکاتەدا خەرجیە گشتیەکانی (بەڕێوەبەرایەتی پلان دانان) گەشتە (هەشتاو دوو ملیۆن دۆلار)... دیسانەوە لەهەمان چوارچێوەدا ، (C.I.A)یەك ملیۆن دۆلاری خەرج کرد بۆ دامەزراندنی(ئەنجومەنی سەربەستی‌مەدەنی)و(٣٠٠هەزار دۆلار)یش بۆ بەشداری کردن لەدامەزراندنی سەنتەرێکی توێژینەوەی‌جیهانی لەویلایەتی (ماساتشوستس)ی ئەمریکی ،جگە لەو خەرجیانەش دەزگای هەواڵگری ئەمریکا بڕی (٥٠,٠٠٠)دۆلاری بەهۆی بەرپرسە تەنزیمیەکانەوە گەیاندە دەستی (وولتر رودز)ی سەرۆکی سەندیکای کرێکارانی ئوتومبێل لەئەلمانیای ڕۆژئاوادا بۆ دابەشکردنی‌بەسەر سەندیکای کرێکاریە ناشیوعیەکانی وولاتدا... لەبەرانبەریشدا یەکێتی سۆڤیەت دەستەو ئەژنۆ نەوەستابوو لەئاکار ئەم دەستیۆەردانانەی ئەمریکا لەکاروباری کرێکاراندا،بەڵکو پتر کارابوو لەهاوکاری کردنی سەندیکا کرێکاریەکانی وولاتانی ڕژئاوادا ،ئەوانەیان کەلایەنگری حیزبە کۆمۆنیستەکان بوون نەخاسمە لەئیتالیاو فەرەنسادا.

لەلایەکی ترەوە (C.I.A)هەڵمەتێکی بەرفراوانی دەستپێکرد لەپێناوی هاوکاریکردن و فراوانکردنی بلاوبوونەوەی یەکێتیە کرێکاریەکانی‌سەندیکای پیشەسەربەستەکان لەئەوروپاو جیهانی سێهەم دا (ئارثەر گولدنبرگ)لەپشتی ئەم هەڵمەتانەوەبوو ،ئەم پیاوە پۆستی بەڕێوەبەری کاروباری کرێکارانی لە (ن.خ.إ) دا هەبوو ...دواتریش بوویە (وەزیری کاری) ئەمریکا ...وەیەکێکیش بووە لەدادوەرانی دادگای تمیز لەوولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا .

ئامانجیش لەزاڵ بوون بەسەر ئەو یەکێتی یانەدا ،بەکارهێنانیان بووە وەك میکانیزمێك بۆ پروپاگەندەو بلاو کردنەوە،هەروەها گواستنەوەی ئامۆژگاریەکانی (C.I.A)و ڕێنماییەکانی بەڕێگەیەکی پەنهانی و دراسە کراو .بەئەندازەی کارکردنیشی لەڕیزی سەندیکا کرێکاریەکاندا ، (C.I.A) کاری لەنێو یەکێتیەکانی لاواندا

کردوه..بۆنمونه(بزوتنەوەی لاوانـــی ئـەوروپایی) لـەماوەی (١٩٥١-١٩٥٩) ; بـڕی (یەك ملیۆن و سێ سەدهەزار پاوەند)ی لە(C.I.A)وەرگرتووە ...لـەسـالّی ١٩٧٥ز دا تۆم براون ی کۆنە کارمەندی بەشی(ڕێکخراوە جیهانیەکان)لە (C.I.A)دا ڕاسـتی ئەم زانیاریانەی دووپات کردەوە.

لەکاتێکدا (C.I.A )لەڕێکخستنی بەشەکانی بویەوە ،و هێرشی ڕاگەیاندنی ڕێـك و پێکـــی دەســـتپێکردبوو ،(K.G.B) هێشـــتر لـــەژێر گۆڕانکاریـــە بنەڕتیـــەکاندا لەهەردووبواری ڕێکخستن و کارکردندا جێنگلّی دەهات...

لەکۆتاییەکانی ســـەردەمی ســتالین دا ،کـت ومـت لەسـەرەتای پـەنجاکان دا ،خـوە شـێتانەکانی سـتالین توونـــد وتیـــژ ببـــوو،ڕوگـــە ســـەلّتەویەو تۆقێنـــەرەکانی پـــتر هەلّچووبوو،ئەمیش وایکرد(K.G.B)زیاتر پێش بکەوێت لەهۆنینەوەی پلانی ناپاکانـە لەدژی هاولاّتیە سۆڤێتیەکانی خۆیی و دوژمنەکانیشـــی لـەدەرەوەوەپێکـەوە...لەوکاتـەدا (بریا)پێشتر بەرپرسی دەزگای موخابەراتی سۆڤیەت بـــوو بـارودۆخی زۆر لـە قەلّـسـی دابوو،چوون هەستی دەکرد بەمەترسی شێتیەکانی ستالین لەسەر ژیـانی تایبـەتی خـۆی ...گەر ووتەی ڕابەرە سۆڤیەتیەکە بەڕاست بگێڕین ئەوا ستالین ئامادەباشی وەردەگرت بۆ لەسێدارەدانی (بریا) بــە تۆمـەتی کـەم تەرخـەمی کـردن لەئاشـکرا کردنـی پلانـی ناوخۆیی لەدژی ستالین ئەمـەش لـەپاش ئـەو ئەرکـەبوو کەسپاردی بـە (بەڕێوەبـەری ئاسایشی دەولّەت)بۆ هەلّبەستنی ڕاپـــۆرت لەسـەر ئـەوەی گوایـە هـەندێك پزیشـکی سۆڤیەتی کەزۆرینەیان جولـەکەن ،هەولّی تیرۆرکردنی ســتالینیان داوە ،(ئـەگناتیاف)ی بەڕێوەبەری ئاسایشی دەولّەتیش ئاگادار کرابوویەوە،ئەگەر بێت و ئیعترافات بەهـەرچی شـێوازێك بێـت لـەو پزیشـکانە وەرنـەگرێت ،ئـەوا سـزای لەسـێدارەدانی بەســـەردا دەسەپێنرێت ... تەنها لە سێدارەدان.

وەلێ ستالین بەرلـەوەی هەڕەشەوگوڕەشەو پلانەکانی لەدژی بریا جـێ بـەجێ بکـات مرد،پاشتریش هەندێك ناوەند گومانیان وابوو بریا لە پشتی مردنی ستالینەوەیە ،نەخاسمە

كه(بريا) هەوڵی دابوو لەمیانەی تواناكـانی (K.G.B)و ڕۆڵـی گرنگیـەوە لـەژیانی گشتی دا ،دەستەڵات بگرێتە دەست.

(وێنەی یەكێكە لە شەقامەكانی ئەلبانیا ، ئەو بارودۆخی هەژارییە ڕوون دەكاتەوە كـە لـە سـەردەمی هۆكسـادا وڵاتی پێدا تێ دەپەڕی ).

سـەرەنجام مەكتـەبی سیاسـی پـارتی كۆمۆنیسـتی بەهـەما هـەنگی لەگـەڵ (نیكیتـا خروشوف) هەوڵەكانی (بریا)ی پوچەڵ كردەوە و بڕیارێكی دەركرد كە(بریا)لەسێدارە دراوە ،بڕیاری هاوەڵی ستالین و رابەری پێشوی موخابەراتی سۆڤیەتی.

لەدوایدا سـەركردایەتی سـۆڤیەت توانـی ڕۆڵـی نـاوخۆیی موخابەراتەكـەی سـتالین لەقاڵب بدات ،كەپەیڕەوی تۆقاندنی كردووە لەدژی مەكتەبی سیاسی وحیزبی شـیوعی ،وەك چۆن بەئاشكرا لەدژی هاوڵاتیە ئاساییەكانیسـۆڤیەت پـەیڕەوی هـەمان شـێوازی كردووە بەوەش دەستەی هەواڵدەری سۆڤیەت ،لەدەستەیەكی وەزاری سەربەخۆوەبووە لیژنەیەكی هێمنایەتی و ناونرا (لیژنەی ئاسایشـی دەوڵـەت) كەئێسـتاكە لەئاسـتی نێـو دەوڵـەتیدا بـە (K.G.B)دەناسـرێت (K.G.B)كۆمـەڵێك دەسـەڵاتی زۆری

لێسەنرایەوە کەلەسەردەمی ستالین دا لەدەستی دابوو ،بۆنموونە دەسەلاتی دەستگیرکردنی ئەندامانی حیزبی شیوعی و دادگای کردنیان لەدادگای تایبەتی دا ،هەروەها دەسەلاتی چاودێری کردنی کامپی کاری قورس و زیندانە سیاسیەکان لەهەمان ڕووە وە ژمارەی کارمەندانی سەر بولیژنەی نوێی(K.G.B) کەم کرایەوە.
هەروەها دەستەلاتەکانی وەزارەتی ئاسایشی دەولەت کورت هەلهێنرا کەلەپاشدا بریتی کرا لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی پۆلیسی ناوخۆیی لە ولاتدا ڕاگەیاندنی دامەزراندنی دەزگای (K.G.B)..ژەنەرال (ئیفان سیرۆف) کەیەکێك لەیاریدەرانی (خرۆشۆف)و فەرماندەی پێشووی پۆلیسی ئۆکرانی بوو ،کرایە بەرپرسی دەزگاکە.وەلێ بەڕێوەبەرایەتیەکەی کارانە بوو لەسەر ئاستی (ئاسایشی دەولەت) کەبەکردەوە (ئەلسکەندەر شلبین)چاودێری کاروبارەکانی دەکرد... شیاوی ئاماژە پێکردنە (شلبین)توانی سالی ١٩٥٨ژەنرال(سیرۆف)لەکار لابدات و خۆی بکاتە ڕابەری (K.G.B)...

سەرەڕای ئەم گیر وگرفتە سیخوڕانەیە ،موخابەراتی سۆڤیەت کەم تەرخەمی نەکرد لەپەرەدان بەپروپاگەندە وچالاکیە سیخوڕیەکانی لەنێوان سالانی (١٩٤٨-١٩٥٣)دا کۆمەلێك لەهەوالدەرە سۆڤێتیەکان چوونە نێوکاری ڕۆژنامە نوسیەوە ،توانیان شالاوی ڕاگەیاندنی سەرکەوتوانە بکەنە سەر وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و سیاسەتەکانی لەژاپۆن دا ..هەروا بێتەوە توانیان (١٣٠)ئامێری گوێ شنە ووتن لە بالوێزخانەکانی ئەمریکا دا دابنێن و لەبالوێزخانەی ئەمریکاشدا لە(مۆسکۆ) (٤٤)ئامێری گوێ هەلخستن یان بەتەنها لەسالی (١٩٥٢ز)دا دامەزراندبوو.

لەبەرانبەریش دا (C.I.A )توانی لەسالی ١٩٥٦ز دا دەقی ووتارێکی نهێنی ڕابەری سۆڤیەتی (خرۆشۆڤ دەست بکەوێت)کەلە کۆنگرەی بیستەمی حیزبی شیوعیدا خوێندبوویەوە و تیایدا تاوانکاریەکانی ستالینی ریسوا کردبوو هەروەها ڕەخنەی لەستالین گرتبوو لە بەڕێوەبردنی وولاتدا ..ئەم کردەوە سەرکەوتوانەی (C.I.A

)موخابەراتی سۆڤیەتی دووچاری حەپەسان و سەرە سوڕیَ کرد ئەمان پێیان وابوو گەیشتنی ئەو ووتارە بەرای گشتی رۆژئاوا ،دەبێتە پاساو دەری ئەوکردەوانەی (C.I.A )بەنهێنی لەدژی شیوعیەکان لەگێتی دا پێی هەڵدەستێ ،جگە لەوەی موخابەراتی ئەمریکا دەتوانێت ناوەرۆکی ووتارەکە بەپێی ئارەزووی سەرانی ڕامیاری خۆیان قەبە بکەن.

لەڕاستی دا تاکو ئێستا کەس نهێنی دزینی ووتارەکەی خرۆشۆف لەلایەن (C.I.A )ەوە بۆ ڕوون نەبۆتەوە ،بەلاَم زانیاریەکان دووپاتی ئەوە دەکەنەوە کەووتارەکە لەرێگەی (جیمس ئەنگلتۆن)ەوە گەشتووە،چونکە هەندێ کەس گومان دەبەن پەیوەندی توونـد و تۆلّی بە مۆسادی ئیسرائیلیەوە هەبوبێت ئەمە لەکاتێکدا هەندێکی دیکە لەزانیاریەکان پێ لەسەر ئەوە دادەگرن ووتارەکەی خرۆشۆف لە ڕێگەی (ڕینارد گیلین)ی بەرپرسی دەزگای هەواڵگری ئەلّمانیای ڕۆژئاواوە گەشتبێتە (C.I.A ).

بەهەر حالّ گەر ئەو زانیاریانە ڕاست بن کە ئاماژە بەرۆلّی مۆساد دەکەن لەرفاندنی ووتارەکەدا ،ئەوا دەتوانین بلّێین ئیسرائیلیەکان لەرێگەی بەکرێگیراوەکانیانەوە لە (پۆلّەندا)توانیویانە دەقی‌ی ووتارەکە چنگی خۆ بخەن .

شیاوی یادخستنەوەیە مەسەلەی دەستکەوتنی ووتارەکەی خرۆشۆف خالّی گرنگترین نەبوو لەسەرکەوتنی ئەرکەکەدا ،بەلّکو چۆنێتی بلاّوکردنەوەی ناوەرۆکی ووتارەکەخالّی هەرە وورد و گرنگ بوو.چاودێری سۆڤیەت لە (C.I.A )دا (د.رای کلین)پێشنیاری کرد بەیەك جار دەقی ووتارەکە بلاّو بکرێتەوە ،لەکاتێکدا ئەنگلتۆن و وایزنر سوور بوون لەسەر بلاّوکردنەوەی ناوەرۆکی ووتارەکە بەشێوەی بەش بەش ،بۆ ئەوەی لەهەرکاتی بلاّو کردنەوەی ووتارەکەدا سوودی لێوەر بگیرێت لەبرەو دان بەپروپاگەندە لەدژی سۆڤیەت ..لەدوای مشت و مرێکی درێژ لەسەر لەبارترین شێواز بۆبلاّوکردنەوەی ووتارەکە ،لەسەنتەری (بەڕێوەبەرایەتی پلان دانان) لە (واشنطن)،بیرۆکەکەی (د.کلین)پەسەند کرادەقی ووتارەکە بەتەواوی لەرۆژنامەی

نیویۆرك تایمز دا بلاوكرایەوە ،وەلێ تارۆژی ئەمڕۆمان ،چاودێران دڵنیا نەبوون لەدرووستی ئەو زانیاریانەی (C.I.A )بلاوی كردنەوە،سەرەڕای پێداگریەكانی (C.I.A )لەسەر ئەوەی زانیاریەكان وورد و سەرچاوەكانیش باوەڕپێكراون ...ساڵی (١٩٥٦)یش، (C.I.A)بەلێبڕاویەوەبیری لەڕێگەیەكی نوێی سیخوڕی كردن بەسەر سۆڤیەتەوە كردەوە ،كەزانیاری وورد و دۆكیو مێتی نەگۆڕی بۆ دەستەبەر بكات ،لەدوای ئەو ئەزموونە پڕكۆسپ و لەمپەڕەی دەزگاكە پیایدا تێپەری لەمیانەی مامەڵەكردنیدا لەتەك هەواڵدەرە باوەڕپێنەكراوەكاندا،مامەڵە لەگەڵ هەندێ بەكرێگیراو و هەواڵدەر مەترسی دروست دەكات لەسەر درووستی بڕیارەكان و زانیاری پێویست لەكاتی خۆیدا مسۆگەر ناكات .

لەبەر ئەوە (C.I.A )دەستی كردە نەخشە ڕێژی بۆ پرۆژەی درووست كردنی فرۆكەی چاودێری ی سەربازی كەلەپاشدا ناونران (یو ٢ یچاودێری )،هەرلەم ماوەیەدا سەرۆكی ئەمریكا ئاشكرای كرد ولاتەكەی نیازمەندە پشت ببەستێت بەوێنەی ئاسمانی وەك میكانیزمێك بۆسنور بەندكردنی ماراسۆنی خۆ پرچەك كردن یاخود داماڵینی چەكی ناووكی بەتەواوی لەیەكێتی سۆڤیەت و وولاتە یەكگرتوەكاندا ،بەلام خرۆشۆف پێشنیارەكەی بە پێشنیاری خەیاڵی ناوزەد كرد.

دوابەدوای سەركەوتنی پرۆسەی درووستكردنی (یو٢)ی تایبەت بەوێنەگرتنی ئاسمانی بنكە موشەكیەكانی سۆڤیەت و هاو پێچەكانی، (C.I.A )بەهاوكاری هێزی ئاسمانی ئەمریكی هەستا بەتەرخانكردنی (١٠٠)فرۆكەوان بۆكاری سیخوڕی ئاسمانی یەكێك لەفرۆكەوانەكان فڕۆكەوانی بەناوبانگ (گاری بورز)بوو، كەلەكاتی جێبەجێ كردنی ئەركەكەیدا بەدیلی كەوتە دەستی سۆڤێتیەكان ئەمریكیەكان لەنێو سەرجەم بنكە ئاسمانیەكاندا ،بنكەی ((أنشرلیك))ی ئاسمانی توركیان لەنزیك (ئەچنە)وە هەڵبژارد بۆ بەڕێكردنی كردەوە سیخوڕیە ئاسمانیەكان لەدژی سۆڤیەت ئەو دەم (C.I.A )بڕی

( فڕۆکەیەکی ( U-2 ) ی ئەمریکی بۆ سیخوڕی کردن لە بەرزاییەکی زۆر بڵندەوە دەفڕن ، زۆرینەی بڕواکان لە دەوری ئەو ڕایە دەسوڕانەوە کە هەڵفڕین لە بەرزی ٨٥ هەزار پێ لەسەر زەوییەکانی سۆڤیەت فڕۆکە سیخوڕیەکە دەپارێزێ لە موشەکی دژە هەوایی ، بەڵام سۆڤێتییەکان موشەکە دژە هەواییەکانیان پەرە پێدا تا ڕادەیەك توانیان فڕۆکەی (U-2) ی ئەمریکی بخەنە خوارەوە ) .

(٣٠,٠٠٠)دۆلاری تەرخان کرد بۆ (گاری بورز)و هاوەڵاکانی بۆ دەستبەکاربوونیان لەپرۆسەی چاودێریکردنی هەواییدا (بورز)خوودی خۆی لەساڵی (١٩٥٦)دا بۆیەکەم جار دەستبەکاربوو لەم ڕێگە مۆدێرنەی سیخوڕی کردنداو ڕچەی بۆ فڕۆکەوانەکانی‌تر شکان . لەماوەی چوار ساڵی یەك لەدووی یەکیشدا ،(یو2)سەرکەوتوبوو لەوێنەگرتن و کۆکردنەوی زانیاری لەسەرسەکۆی موشەکە سۆڤیەتیەکان ،سەنتەرەکانی ڕاهێنان و عەمبار کردنی چەك ،فرگە سەربازیەکان، کارگەکانی درووستکردنی کلاوەی ئەتۆمی و ژێردەریایی... هەرچەندە درووستکردنەکەی سەرەتایی بوو بەلام فڕۆکەکان دەیان توانی لەبەرزی

(٨٥,٠٠٠)پـیٚ دا بفـڕن ،بەمـەش لەژێرکاریگـەری بەرەنجامـەکانی (کـەش)دا خـۆی قوتارکرد ، ئەگەرچی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەکەی (گاری بورز) لەسـەر زەویـەکانی سۆڤیەت و دیل کرانی،گورزێکی کاریگەر و بکوژبوولە پرۆژەی (سـیخوڕی ئاسمـانی) دا و بوویە ریسواییەکی دیکە لەڕیسواییەکانی (C.I.A )..

لە(١/٥/١٩٦٠)دا ،لەکاتێکدا (بورز) بەسەر ئاسمانی ناوچـەی (سـفر دلوفسـك)ی سۆڤێتیدا دەفڕی ،فڕۆکەی (یو2)ەکەی بەهۆی ڕۆکێتی (S-A2)سۆڤیەتی یەوە خرایـە خـوارەوە ..ئـەم لـەکاتێکدا ژیـانی دیلـی هـەڵبژارد بەسەرخۆکوشـتن بەکەپسـولە بکوژەکەی C.I.A کەناسراوبوو بە(سیانید)دەستگیرکرا ...دوابـەدوای ئـەم ڕووداوە ،پەیوەندیـە نێودەوڵەتیـەکان ئـاڵۆزبوون دانوسـتاندەرەکان کەوتنـە پەلەپـەل بـۆ نزیکخستنەوەی بیرو ڕاکان و گرێدانـی کۆبوونەوەیـەکی (لووتکـە)لـەنێوان هـەردوو زەبەلاحەکەدا .لەکۆتای ئەم هەولانەدا بڕیار درا لە(١٦/٥/١٩٦٠)دا ،کۆبونەوەیەکی کتوپڕی لەنێوان سـەرۆکی ئـەمریکاو سـۆڤیەت دا بـەئامادەگی بەرپرسـانی فەرەنسـاو بـەریتانیا گرێدرێـت ،کـەچی گرێـو گۆڵـەکانی کێشـەکە یارمـەت دەر نـەبوون بـۆ سازدانی کۆبوونەوەبالاکە..سەرۆکی ئەمریکا هەرچی ئاگادار بوونێکـی خـۆی بەرانبـەر ئەرکی فڕۆکەوان (بورز)ڕەتکردەوەو بیٚئاگایی‌خۆی لەو چالاکیە نیشاندا لـە کـاتێکدا (بورز)لەو کۆنگرە ڕۆژنامەنوسییەی لـە (مۆسـکۆ)،ڕۆژی(٧/٥)گـریٚی‌دا ڕایگـەیاند سەرۆکی ئەمریکا مۆڵەتی ئەم چالاکیە سیخوڕیەی داوە و(C.I.A )شی ڕاسپاردوە بـۆ جیٚبەجیٚکردنی ..وەلیٚ تا هەنوکـە ،هیـچ کەسـێك نـەیتوانیوە پـەردەلابدات لـە ڕوی ئەولایەنـەی ،مۆڵـەتی کردەوەیـەکی مەترسـی داری بەوشـێوەیەی داوە،لـەو قۆناغـە ناسکەی ئـاڵۆزی نێـوان ڕۆژ هـەڵات وڕۆژئـاوادا..لیژنـەی پەیوەندیـە دەرەکیـەکانی (ئەنجومەنی پیران) ئەودەم ڕایگەیاند :(هیچ کام لەسەرۆك و وەزیری دەرەوەو وەزیـری بـەرگری ،ئاگایـان لـەفڕینی ئـەو فڕۆکەیـە نـەبووە کەسـۆڤیەت خسـتوویانەتە خوارەوە)...شـیاوی ئامـاژە پێدانـە ،ئـەم ئەرکـەی بـورز ،ئـەرکی ژمـارە (٣٠)بـوو

کەلەماوەی چوار ساڵی یەك لــەدوای یــەکی سـیخوڕیدا بـەڕێ دەکـرا،بەڕێوەبـەری C.I.A لەوسەردەمەدا (ئالن دالاس) هەموو جۆرە ڕاوەستانێکی خۆی چ بەئاشکرا چ بەنهێنی بۆ لێپرسینەوە لەبەر دەم لیژنەی پەیوەندیە دەرەکیەکان دا ڕەت کردەوە..

لەکۆتایدا دالس لەوازیە سـیخوریەکەیدا سـەرکەوتوو نـەبوو،ئـەوەندە هەیـە توانـی نمونەیەکی ڕوونـی ئەویاریـە سـیخوڕیانە پێشـکەش بکـات کەهـەرکام لـە (C.I.A ) و(K.G.B)پێی هەڵدەســتن...سەبارەت بەفرۆکەوانـە دیلەکـەش ،سـزای زیندانـی کردنـی بۆمـاوەی (١٠)سـاڵ بەسـەردا درا ،تەنـها (١٨)مـانگی لـەماوەی سـزاکەی لــەزینداندا بردەســەر ،ئـەوەبوو دانوسـتانەکان سـەرکەوتن لەسـازدانی ڕێ و شـوێنی گۆڕینەوەی سیخوڕەکان بۆیەکەم جار ...(بورز) لەزیندان ڕزگار کرا لــەپاش ئـەوەی وولاتە یەکگرتووەکان قایل بوو لـەسەر بەردانی سیخوڕی سـۆڤیەتی (ویلـی رودولـف ئابل)ی ڕووخسار لاکێشەی و خاوەنی ئەدگارە شەڕەنگێزەکان. (ئابل) لـەدایك بــووی ئینگلتەرایە لـەسـاڵی (١٩٠٣ز)دا،نـاوی ڕاستەقینەشـی (ولیـەم فیـشر)ە، بـاوکی ئـابل هاوڕێ و دۆستی (لینین)ی ڕابــەری شۆڕشـی کۆمۆنیسـتی ڕووسـیا بـوو ،بۆیـە ئـابل لەساڵی (١٩٢٠ز)دا پەیوەندی کرد بەپارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی یەوە ،پـاش ئـەوەی نیشتە جێ بوونی خۆی لەبەریتانیاوە گواستەوە بۆ سۆڤیەت ،هێشتر ماوەیـەکی کـورت تێپەڕی بوو بەسەر پەیوەندیکردنیدا بەحیزبی شیوعیەوە،بویە کارمەند لەدەزگای هەواڵ دەری سۆڤیەت دا...ئارەزوویەکی بەرز و توانایـەکی زمانـەوانی و سـیخوڕی لـەڕادە بــەدەری نیشــان دا،لــەماوەی خوێندنــی پــەیمانگای تەکنــەلۆژیای ئــەلمانیدا لەبەرلین،بەدەرچوونی لەپەیمانگا،ئابل خرایە خــوولی سـیخوڕی کردنـەوە لەپـەیمانگای هەواڵدەری سەربازی لـە (مۆسکۆ) لـەساڵی (١٩٤٩ز)ش ناوی هاوولاتیەکی ئـەمریکی لەخۆینا کە(لیتوانیا) مردبوو ،لەکاتێکدا ویستی سەردانی یەکێك لـەخزمـەکانی بکـات ،لەوکاتەوە ناوی خۆی کردە (ئـەندرو کـایوکیس)و جێگـەی هاولاتیـە مردووەکـەی گرتەوە ...لەژێر پەردەی هەمان ناوی خوازراوەوە چوە کەنەداو ماوەیەکی کورت لــە

ناوچەی (کیوبك)ی کەنەدی دا ژیا ،بۆوەی لەوێندەرێ وە بچێتە زەویەکانی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە..لەم کاتەدا ناوی خۆی گۆڕی و کردیە (ئەمیل.ر. گۆڵدفس)لەوێدا وەك وێنەگرو کارتلنگ دەستی بەکار کرد لەناوچەی (بروکلین)دا... لەوساتەوە،تاکو سالّی ١٩٥٧ز ئابل هەستاوە بەئەنجام دانی چەندین کردەوەی سیخوڕی و توانیوەتی زۆرێك زانیاری بەپێز بگەیەنێتە سۆڤیەتیەکان .لەیەکێك لە ووتێلەکانی نیویۆرك دا دەستگیرکرا لەکاتێکدا ناوی خوازراوی (مارتن لولین)ی لەخۆی نابوو ،بەهۆی ئەوەی هەمووکارکردنێکی لەگەڵ (C.I.A) دا ڕەت کردبویەوە بۆماوەی سی ساڵ سزای زیندانی کردنی بەسەردا درابوو ..وەلێ کەوتنە خوارەوەی فڕۆکە سیخوڕیەکەی (بورز)و دیل کرانی فرۆکەوانەکە ماوەی زیندانیەکەی ئەمیشی کورتکردەوە و لەپرۆسەیەکی گۆڕینەوەی سیخوڕاندا هەردوو سیخوڕەکە ئازاد کران سەبارەت بەپرۆسەی گۆڕینەوەکە ،پارێزەرێکی نیویۆرکی بەناوی جیمس دونوفان ی کۆنەکارمەندی (ن.خ.إ) ڕاسپێردرا تاکو زەمینە سازی بکات ...لەسەرەتادا،دانوستانەکان بەنامە گۆڕینەوەی نێوان(دونوفان)و ژنی سیخوڕە سۆڤیەتیەکە(ئایلین ئابل)دەستی پێکرد ...کەهەندێك واگومان دەبەن ئەم ئافرەتە بەکردەوە بەشداری نەکردووە لەنامە گۆڕینەوەکەدا ،بەڵکو تەنها بەناو بەشداری کردووە ،هەر کەدوونوفان نامەکانی (ئایلین ئابل)ی بەدەست دەگەشت ،دەینارد بۆ (لورنس هیوستن)ی ڕاوێژکاری گشتی (C.I.A) ،ئەمیش بەڕۆلی خۆی پۆزەتیفانە وەلآمی دایەوە و مۆڵەتی دا هەردوو دیلەکە ئالوگۆڕ بکرێن، بۆیە (دونوفان) بەوپێ یەی هاولآتی یەکی ئەمریکیە ،گەشتە بەرلین بۆ ئەوەی لە کۆتا قۆناغ دا بەرد بخاتە سەر مەلۆی ئالّ وگۆڕکردنەکە ...

لەمانگی (١٩٦٢/٢ز)دا توانی (گاری‌بورز)بگۆڕێتەوە بەسیخوڕە سۆڤیەتیەکە لەخالّی تێپەرین دا لە بەرلینی ڕۆژهەلآت کەناونرابوو (پردی گلیانیکر)..شیاوی ئاماژە پێدانە ئەم کردەوەی ئالوگۆڕە ،نمونەیەك بووو بۆ ئەوکردەوانی پاشتر لە هەمان

خاڵەوە بۆ هەمان مەبەست بەرێکران ،لەلایەکی ترەوە لەهەمان ساڵدا گەڕایەوە بۆ یەکێتی سۆڤیەت و پاشماوەی ژیانی لەوێ بەسەربرد تائەوەبوو لەساڵی ۱۹۷۱ز دا کۆچی دوایی کرد.

کەوایە قۆناغی پەنجاکان قۆناغی بەرفراوانبوون و گەشەکردن بوو لەبواری پروپاگەندەو سیخوڕایەتی دا ،هەریەکە لە(C.I.A ) و(K.G.B)سەرکەوتو بوون لەدامەزراندنی دەستە (کرێکاری-ئیعلامی)یەکانیان لەئەوروپاو هەموو جیهان دا بۆ بەرفراوانکردنی بوارە سیخوڕیەکان ،هەروەها چەندین کردەوەی نهێنیان لەبەرژەوەندی وولاتەکانیان بەڕێوەبرد،لەگەڵ یەك جیاوازیدا کەبریتی بوو لەوەی حکومەتە سۆڤیەتیەکان بەبەردەوامی ئاگاداری کردەوەکانی (K.G.B)بوون بەڵام کابینەکانی ئیدارەی ئەمریکا زۆر جار ئاگایان لە چالاکی و ئامانجەکانی (C.I.A) نەبوو.. لەلایەکی ترەوە پاکتاوکردنی جەستەیی سیخوڕە دێرینەکان و سیخوڕە دژەکان مەسەلەیەکی یەکلاکراوەبوو لەکردەوەکانی (K.G.B)دا ،لەبەرانبەردا ئەم مەسەلەیە جێگەی مشت و مڕ بوو لەنێوان بەرپرسانی (C.I.A) دا ،لەنێوەڕاستی پەنجاکاندا یەکێك لە مامۆستاکانی (C.I.A)بەقوتابیەکانی دەڵێت:(لەهەندێك حاڵەتدا پێویستە (C.I.A) هەستێت بەپاکتاوکردنی دژەکانی و ئەوانەی دەبنە مەترسی بەسەر کارەکانیەوە)ئەم گووتەیە دەروازەی مشت ومڕێکی بەربلاوی والاکرد لەنێوان لایەنگران و نەیارانی بیرۆکەی پاکتاوکردنی جەستەیی دا..

هەرلەهەمان ماوەدا لەدیرۆکی دانانی کاروبارە سیخوڕیەکان لەجێگەی خۆیاندا ،چەند ڕووداوێکی گرنگ لەجیهان دا ڕووی دا ،لەوانە دەست تێوەردانی (C.I.A) لەژیانی ڕامیاری ئێران و ،کاروبارەکانی گوانیمالاو کوبا لەئەمریکای لاتینی دا.

# بەشی چوارەم

## ﴿ دەست تێوەردانی دەزگای هەواڵدەری ئەمریکی ﴾

لەسەرەتای پەنجاکاندا ئادگارەکانی دەست تێوەر دانی دەزگای هەوالگری ئەمریکا لەکاروباری وولاتەناشیوعیەکاندا هێدی هێدی بەرچاودەکەوت ،ئێرانیش یەکەم ڕووی ئەدگاری دەست تێوەردانەکە بوو ..

دوای دووساڵ لەدرەوشانەوەی ئەستێرەی سەرۆك وەزیرانی ئێران (محمد مصدق)،کەتوانی بووی دەسەلاتەکانی شا سنوور بەند بکات ،و شیوعی و نیشتمانیەکانیش پشتگیریان لێدەکرد ،ساڵی ۱۹۵۳ز ،دەزگای هەواڵدەری ئەمریکا هەولەکانی خۆی دەستپێکرد بۆ قووتار بوون لەو سەرکردە نیشتمانیە ،(مصدق)بەهۆی خۆماڵی کردنی کۆمپانیای پەترۆلی (بەریتانی-ئێرانی)یەوە توانی جەماوەری زیاترو زیاتر بۆخۆی مسۆگەر بکات ،چونکە زۆرینەی ئێرانیەکان کۆمپانیاکەیان بەکۆمپانیایەکی سەرمایەداری ئیمپریالیزمی لەقەلەم دەدا ...لەهەمان کاتدا مصدق هەڕەشەی لەبەرژەوەندیەکانی بەریتانیا کردوو ڕێگەشی بڕی لەئەمریکیەکان لە گرتنە دەستی سامانەکانی ئێران لەدوای ئینگلیز(وەك لەساڵی ۱۹۵٦یش دا ڕوویدا سەرۆکی مصری (جمال عبدالناصر) بڕیاری خۆماڵی کردنی نۆکەندی سویسی دەرکرد)لەمیانەی هەستکردنیان بەڕەوشەکە ئینگلیز بەهاوکاری ئەمریکیەکان گەمارۆی ئابوریان دژی ئێران پەیڕەو کرد بۆوەی جەماوەری مصدق کەم بکەنەوە ،لێرەشەوە هەولیان دا ،لەساڵی ۱۹۵۲ دەزگای (C.I.A) قایل بکەن بۆوەی لە قووتار بوونی مصدق هاوکاریان بکات وەلێ لەسەرەتادا (C.I.A) نەبزاو متەقی لەخۆی بڕی بەهۆی هەلوێستی پارێزگاری سەرۆك ترومانەوە لەم ڕوەوە ... ئەگەرچی

هەڵۆیستەکە گۆڕا بەدەست نیشانکردنی (جون فوستر دالس)لەپۆستی وەزیری دەرەوەی ئەمریکادا .. ئەم وای دەبینی ڕەوشەکە لەمەڕ ئێران پلانێکی سۆڤیەتی یەو لەدژی ڕۆژئاوا پەیڕەو دەکرێت و تەحەدایەکی ڕوونی بەریتانیاشە کە وولاتە یەکگرتوەکان خۆی بەیەکەم میراتگری دەبینێت...بۆ خۆگونجاندن لەتەك ئەم سیاسەتە نوێ یەدا ،(C.I.A )ئاراستەکاری تایبەتی بۆ دەرکرا بەمەبەستی قوتار بوون لە مصدق و ڕابەرایەتیە نیشتمانیەکەی ..(کرمیت ڕۆزفیلت)ی کوڕی سەرۆکی ئەمریکی (تیودور ڕۆزفیلت)(١٨٥٨-١٩١٩ز)وەك بەرپرسیار لەکردەوەکەی لەمەڕ ئێران دەستنیشان کرا ...

(کرمیت)ی ناسراو بە(کیم)پێشوەخت لە (ن.خ.إ) لەماوەی جەنگدا کاری کردووە و لەپاشیشدا بوویە پسپۆری کاروبارەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین...(کیم) لەلای خۆیەوە بۆ جێبەجێ کردنی ڕێنماییەکانی (C.I.A )بەهاوڕێیەتی چەند پیاوێکی سەر بەدەزگای هەواڵگری ،چووە (تاران) و دەستی کرد بەڕاپەڕاندنی کارەکانیلەدەرەوەی حەرەمی باڵوێزخانەی ئەمریکادا .پلانی کارەکە ئامانجی دابڕینی (مصدق) بوولەپۆستەکەیی و دانانی ژەنەراڵ (قازالله زاهدی)وەزیری ناوخۆبوو لەجێگەکەیدا،بۆوەی دەستەڵاتەکانی شا بگەڕێنێتەوە سەرووڵات .

بەپێی ڕێنمایی ئەمریکیەکان شا هەستا بەلەکارلادانی مصدق و ژەنەراڵ زاهدی لەجێگەکەیدا دانا .وەلێ مصدق بڕیارەکەی شای ڕەت کردەوەو ڕووناکی سەوزی بۆ لایەنگرانی هەلکرد تالەدژی شاو بڕیارەکەی خۆ پیشان سازبکەن .ئەوەبوو شەقامەکانی تاران هەزاران لایەنگری مصدق یان تێرژا،کە لەدژی پەهلەوی و سیاسەتەکانی خۆپیشاندانیان سازکردو فەوزا ووڵاتی گرتەوە.

ئاژاوەی نێو ووڵات بونەهۆی هەڵاتنی شا بۆ (بغداد) و لەوێوە بۆ (ڕۆما)و لەوێ لەگەڵ بەڕێوەبەری (C.I.A) دا کۆبویەوە ،(ئالن دالس)ی بەڕێوەبەری (C.I.A) لەوکۆبونەوەیەدا بەشای ڕاگەیاندبوو:جەنگ لەدژی مصدق کۆتایی نەهاتووە و

گەڕانەوەی ئەمیش بۆ تاران شێوە مسۆگەرێکە...لەتارانیش رۆزفیلت لەسەر پەتی ناکۆکیە سیاسیەکانی ئێران یاری دەکرد و،دارایەکی زۆری خەرج کرد بۆدژایەتی کردنی (مصدق) و هاوکاری سەرۆك وەزیرانی نوێ (ژەنراڵ زاهدی)هەروەها بەهاوکاری دەزگای هەواڵگری ئێرانی (ساواك)توانی بڕیاری لەکارلادانی (C.I.A) (مصدق) لەناوەندە ڕەسمیەکان و چەند بڵاو کراوەیەکی تری پشتگیری کار لەشا بڵاو بکاتەوە ... لەسەرتاسەری وڵاتدا لەکاتێکدا ژمارەیەك لەبەکرێگیراوانی (C.I.A) پەیوەندی ڕاستەوخۆیان کرد بەهەندێ لەئەفسەرانی سوپای ئێرانەوە بۆوەی هاوکاری هەلۆێستەکانیان لەدژی (مصدق) دا بکات..

( خەلەبانی دیل فرەنسیس گاری بورز ، سۆڤێتیەکان لە (١٩٦٠/٥/١) دا فڕۆکەکەیان خستە خوارەوە ، جگە لەوەی بۆ یەکەمجار بوو فڕۆکەیەکی سیخوڕی بکەوێتە خوارەوە ، کەچی (گاری) قوتار نەبوو لە ڕەخنە و گازندەی ئەوانەی پێیان وا بوو گاری خۆی بکوشتایە باشتر بوو لە دیل کرانی و بە ترسنۆك دابوویانە قەلەم چونکە ژیانی بەسەر مردندا هەڵبژارد بوو ) .

پاش ماوەیەکی کەم ئادگارەکانی سەرکەوتنی پلانەکەی رۆزفیلت بەکردەوە لەئێران دەرکەوت و لایەنگرانی (شا) و(زاهدی ) توانیان (مصدق) لەدوای جەنگێکی کتوپڕی لەدژی لایەنگرانی لەنێودەزگای سەربازی سوپادا بەرکەنار کەن،دوابەدوای ئەم سەرکەوتنە ،شا گەڕایەوە بۆ وڵات ،بەمەش لەهەردوو ئاستی دبلۆماسی و ئابووریەوە پلەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پتەوبوو.

( سەرۆك وەزیرانی ئێران (مصدق) لە نەتەوە یەکگرتووەکان بەرگری لە کێشەی وڵاتەکەی دەکات لە بەرامبەر دەست تێوەردانە بیانی‌یەکاندا ، ( C.I.A ) توانی حکومەتەکەی (مصدق) بڕوخێنێت سەرەڕای ئەو جەماوەرە زۆرەی لە ناو ئێراندا هەیبوو ) .

بەگوزەر کردنی یەك ساڵ بەسەر سەرکەوتنی زاهدی دا ،چەند کۆمپانیایـەکی نـەوتی ڕۆژئاوایی پرۆتۆکۆلی بازرگانیان لەگەڵ ئێراندا مۆر کرد بۆمـاوەی (٢٥)سـاڵ بەتەنـها ئەمریکا ٤٠٪ی سەهمی کۆمپانیای نەوتی ئێرانی بەرکەوت ،سوپای ئـێرانیش دەسـتی کرد بـەکڕینی چـەکی ئـەمریکی و ئاسـانکاری بـۆ دامـەزراندی چـەند ویستگەیەکی سیخوڕیئەمریکی لەباکووری وڵات کە هاوسـنووری سـۆڤیەتە دابمـەزرینێت ،جگـە لەوە (C.I.A) پرۆسەیەکی مەشق پیکردنی کادرانی موخابەراتی ئـێرانی (ناسـراو بـە ساواك)ی دەست پێکرد.

لەلایـەکی تـرەوە لەجێگەیـەکی تـری جیـهان ،و لەسـاڵی ١٩٥٤دا ،(C.I.A) ئامادەباشی وەردەگرت بۆ دەست تێوەردانێکی بۆگەن لەکاروبارەکانی (گواتیمـالا)دا ...کەلەبەردا بە(کۆماری موز) ناسرابوو لەساڵی ١٩٥١ز دا ،دانیشتوانی ئەو وڵاتـە کە هاو سنوری وڵاتە یـەکگرتووەکانن و زوربەشیان کشاوەرز و خـەڵکی هـەژارن (یعقوب اربنز)یان هەڵبژارد بۆ پۆستی سەرۆك کۆمار، لەدەسپێکی کارەکەیدا سەرۆکی

نوێ هەوڵی دا بارودۆخی ئابووری وولات بەرەو باشتر بکات ،لەڕێگەی پەیڕەو کردنی زنجیرەیەك ڕێوشوێنی یاسایی لەدژی کۆمپانیا پاوەنکاریەکان و گروپە ئەرستۆکراتیەکان،لەنێو ئەم کۆمپانیایانەدا کەخاوەنەکانیان ٢٪ی دانیشتوان پێك دێنن و ٧٠٪ی زەوی و زارەکانیان لەچنگ دایە،(کۆمپانیای ئەمریکی یەکگرتوو بۆ میوە) هەبوو،کەدامەزراوەیەکی زەبەلاحەو پشتگیری رامیاری (واشنطن)ی دەستگیر کردووە ،ناوبانگێکی پاوانکاری دزێویشی هەیە لەنێو دەستە شەعبیە ڕەش و ڕووتەکانی گواتیمالادا.

سەبارەت بەڕیفۆرمەکانی (ئەربنز)خالّی سەرەکی بریتی بوو لە دابەشکردنی زەوی و زار بەسەر جوتیاران دا بەشێوەیەکی دادپەروەرانەو پشتگیری کردنی سەندیکا کرێکاریەکان و مافی کشاوەرزان لەوولاتدا،،وەلێ ریفۆرمەکانی (ئەربنز)لەتەك بەرژەوەندیەکانی کۆمپانیای ئاماژە بۆکراودا چوونیەك نەبوون،لەڕووی سیاسیشەوە (واشنطن)ڕەفزکردنی سیاسەتی‌نەرم ڕەوانی ئەربنز بوو کەلەبەرامبەر شیوعیەکان و چالاکیەکانیان لە گواتیمالادا پەیڕەوی دەکرد.

لەترسی سەرکەوتنی ئەربنز و هاوپەیمانە شیوعیەکانی لەوەدا گواتیمالا بکەنە دەولەتێکی کۆمۆنیستی لە کیشوەری ئەمریکا دا، (C.I.A) لەمانگی٣/١٩٥٣ دا هەستا بەهاوکاری کردنی بالّی ڕاست ڕەوی گواتیمالا بەچەك و دارایی بۆوەی یاخی بوونێك لەدژی دەستەلاتەکەی (ئەربنز)بەرپابکەن،هەماهەنگیەکانی ئەمەریکا هیچ بەرئجامێکی نەبوو ،ئەمەیش وایکرد سەرۆك (ئایزنهاوەر)ڕاشکاوانە یاریدەدەرەکانی خۆی بەم ووتەیە بدوێنێت:(پێویستە لە ئەربنز قوتاربین بەهەرچی شێوازێك بێت).

بەگوێرەی ئەم جۆرە ڕاشکاویە (یاخود گلۆپی سەوز هەلکردنە لەزمانی موخابەراتی دا)،(C.I.A)(فرنك ویزنر)ی جێگری بەڕێوەبەرایەتی پلان دانانی ڕاسپاردوو ئەرکی قوتاربوون لە ئەربنزی بەسەردا دا... ئەمیش بەڕۆلّی خۆی (کارلۆس کاستیلۆ ئارامس)ی ژەنەڕالّی ڕاست ڕەوی گواتیمالای دەستنیشان کرد بۆوەی ببێتە فەرماندەی

یاخی بوونەکە لە دژی (ئەرسنیز) هەروەها بــەهۆی (C.I.A) ەوە توانــی ژمارەیــەکی گەورەی پەنابەرە گواتیمالیــەکان لــەکامپی مەشــق کردنــی ســەربازیدا لــە نیکــاگوارا کۆبکاتەوە ...لەهندۆراسیش ،ویزنر توانی هــێزێکی ئاسمـانی تایبــەت بــۆ ئەرکەکــەی ئامادەبکات کەپێك هاتبوو،لەفڕۆکەی (B47)ی هێرش بــەر ،فڕۆکــەی گواســتنەوەی (547)..لەسەر سنورەکانی هندۆراسیش ئێستگەیەکی ڕادیۆیــی دامــەزراند بۆهــاندانی گەلی گواتیمالی لەدەستەلاتەکەی ئەرێنز .

لە ئایاری ســالی ١٩٥٤ز دا ،(C.I.A) پــەردەی لــەڕووی زانیــاری لەســەر ئــەو کەشتیە تیشکیانە لادا کەبەپر لەچەکی بەرەو گواتیمــالا چــوون ،ئــەم زانیاریانــە بوویــە بەهێزکەری ئەو بڕوایەی لای بەرپرسە ئەمریکیەکان گەلالە ببوو سەبارەت بە پەیوەندی ئەرێنز بەدەولەتە شیوعیەکانەوە ،بۆیە پتر سوور بوون لەسەر ڕووخــاندنی ڕژێمەکــە .. هەر بەهۆی ئەم زانیاریانەوە ئەمریکا پاساوی هاوکاریە ســەربازیەکانی خــۆی بــۆ بــالی ڕاســت ڕەوی گواتیمــالا دەدا...لەلایــەکی تــرەوە (C.I.A) (٥٠تــەن) چــەك و خواردەمەنی بەرێکرد بۆ کامپــەکانی مەشــقکردن لــەنیکاراگوا ،گەمارۆیــەکی توونــدو تیژی ئاویشی سەپاند بەسەر گواتیمالا داو هەموو کەشتیەکی دەپشــکنی کەبــەرەو ئــەو وولاتە دەچوون بەکەشتی دەولەتە دۆستەکانیشەوە ...

ئەوەبوو (بەریتانیا، فەرەنســا، هۆلــەندا)بەوپــەڕی تونــدو تیــژی نارەزاییــان بەرانبــەر پشکنینەکە دەر بڕی .لەم ڕووەوە بەرپرسێکی بــەریتانی ووتبــووی :(ئــەو کردەوانــەی (واشنطن)بەنــهێنی و بــە ئاشــکرا لــەدژی گواتیمــالا بــەڕێوەی دەبــات هەڕەشــەی هەلگیرســاندنی جــەنگێك دەکــات لــەوێندەر)ســەرەڕای تۆمــەتبارکردنێکی زۆر ،لــە (حوزەیرانی ١٩٥٤ز)داپلانە ئیعلامیەکانی (ویزنر)و ئێستگەکەی (ڕادیۆی ئازادی)کــە بەڕێوەبەرەکەی لەوکاتەدا (دیڤید فیلیبس)بوو ،سەرکەوتو بوو لەکارکردنــە ســەر ڕای گشتی لەگواتیمالا و دەرەوەشــی دا لەبەرانبــەردا ئــەرێنز بــۆ ڕاوەســتاندنی پلانــەکانی (C.I.A) وبالی ڕاست ڕەو،چــەند ڕێوشــوێنێکی گرتەبــەر ،بۆنمونــە:ئابلوقــەدانی

بنکەی گواتیمالای ئاسمانی و ناچارکردنی فەرماندەکەی بەهەڵـهاتن بۆناوچـەکانی ژێـر دەستەڵاتی (C.I.A) لەهندۆراسـی هاوسـنووردا ،بەرلەهێرشـکردنە سـەر گواتیمـالا سەرۆك ئایزنهاوەر بەیاریدەدەرەکانی گوتبـوو:(مـن ئامـادەم بۆدانـانی هـەمووتواناکان لەپێناوی سەرکەوتنی ئەم ئەرکەدا ،ئەگەر سەرکەوتوبین گەلی گواتیمالیش لەگـەڵماندا سەرکەوتووەلەدەرباز بوون لەچنگی مۆتەکەی کۆمۆنـیزم ،گـەر بشـکەوین ،بـەیداخی وولاتە یەکگرتووەکان لەکیشوەری ئەمریکادا کەوتووە).

لـە(١٨/٦/١٩٥٤ز)دا ،کۆلۆنیـل (کاسـتیلۆ ئـارامس)بەسـەرۆکایەتی سـوپایەك لەسـنوورەکانی گواتیمـالا پەڕییـەوە بـەئامانجی ڕوخـاندنی دەسـتەڵاتەکەی ئـەربێنز ،لەکردەوەی پەڕینەوەکەدا فڕۆکە(B-47)ئەمریکیەکانیش بەشداریان کـرد کەئـەرکی بۆردومان کردنی بنکە سەربازی و زیندەییەکانی وولاتی گواتیمالایان پێ سپێردرا بـوو ،لەوانـە(بـەندەری سـان خۆسـیە)لەسـەر ڕۆخـەکانی گواتیمـالا لەبـەری (باسیفیك)دا...(ڕادیۆی ئازادیش)بەشداری پرۆسەی پەڕینەوەکەی کرد بەهەڵبەسـتن و گەورەکردنی ئەوهەواڵانەی لەبەرەکانی جەنگەوە دەگەیشتن...ئـەوێ دەمـێ ،فڕۆکـە هێرش بەرەکانی سەر شـاری گواتیمـالا،بڵاوکراوەیـان دژ بەحکومـەت و ڕژێمەکـەی ئەربێنز بڵاودەکردەوە و داواین دەکرد لە هاوولاتیان پشـتگیری کۆلونیـۆل(ئـارامس)و سوپاکەی بکەن ...لەلایەکی ترەوە ئالن دالـس ی بەڕێوەبـەری (C.I.A) فڕۆکـەی دیکەی بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکەکەی مسۆگەرکرد ،پاش ئەوەی سەرۆك (ئایزنهاوەر)ی قایل کرد کە سەفقەی کڕیتی ئەو فڕۆکانە دەچێتە ژێرناوی (نیکاراگوا) وەك سـتافێکی وازو کەر لەسەر پرۆتۆکۆلی کڕینەکـە ...ڕۆژی ٢٧/٦ ژەنـراڵ (ئـەربێنز)ئـەرکی بـەرەڤانی کردنی لــەگواتیمالاو بـەڕێوەبردنی کاروبارەکـانی وولاتـی خسـتە ئەسـتۆی (ژەنـراڵ کارلۆس دیاز)ی وەزیری بەرگری ،پاش ئەوەی بۆی دەرکەوت قۆناغەکـە قۆنـاغێکی سەربازیەو پێویست دەکات ژەنراڵەکان سەرپەرشتی ڕۆژانەی بەرەکانی جەنگ بکەن..

دەست بەجێ لەدوای گرتنە دەستی ئەم کارە ،ژەنەراڵ دیاز پێداگری خۆی ڕاگەیاند لەبەرگری کردن لەگواتیمالا بەهەر نرخێك بێت ... وەلێ ئەم ڕاگەیاندنە درێژەی نەکیشا ،ئەوەبوو بۆردوومانە ئاسمانیەکان توونددو تیژبوون و فشاری سەربازیش بەهێزتر دەبوو لەسەرهێزەکانی ،بارەگای سەرکردایەتی سەربازیەکەشی لەپایتەخت دا بەر بۆردومان کەوت ،ژەنەراڵ دیاز ناچار کرا هەڵبێتو سەرکردایەتی وولاتی لەبەردەم ئەنجومەنێکی سەربازی بێ تواناادا جێهێشت ،کەهەر خێرا هەڵپەی کرد بۆمۆر کردنی پرۆتۆکۆلی خۆبەدەستەوەدان لە(٢/٧/١٩٥٣ز)دا...بەپێی ئەم پرۆتۆکۆلە ژەنراڵ ئارامس کرایە سەرۆك کۆماری گواتیمالا ،بەوپێ یەی سەرۆکی نوێ نوێنەری چینی دەوڵەمەندەکان و پارێزەری بەرژەوەندیەکانی (واشنطن)بوو لە گواتیمالا دەستپێکی دەست بەکار بوونی بڕیارێکی گەمژانەبوو،بەگوێرەی ئەم بڕیارە (٧٠٪)ی خەڵکی لەمافی دەنگدان بێ بەشکرد بەو بیانووەی نەخوێندەوارن ،بەبڕیارێکی تریش مافی کرێکارو جوتیارانی هەڵوەشاندەوە کە (أزنبر) لەماوەی سەرۆکایەتیەکەیدا چەسپاندبووی .

هەروەها ڕووبەرێکی بەرفراوانی زەوی و زاریشی گەڕاندەوە بۆ (کۆمپانیای یەکگرتووی میوە)، لەکاتێکدا (ئەربێنز)بەسەر جوتیاراندا دابەشی کردبوو .سەبارەت بەپرۆسەی داگیرکردنی گواتیمالا وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لەلێدوانێکی تەلەفزیۆنی دا گووتی:(ئەوی لە گواتیمالا ڕووی دا پەردەی لادا لەڕووی هەڵپەکاریە شەیتانیەکانی (مۆسکۆ) لەپەیدا کردنی جێ پێ یەك لەکیشوەری ئەمریکادا ،بەڵام شۆڕشەکەی ئارامس ڕێگەی لەبەردەم ئەم هەڵپەکاریانەدا بڕی و سەلماندی ململانێ و کێشەکانی ئەو دەڤەرە کێشەیەکی ناوخۆییە لەنێوان شۆڕش و دوژمنەکانی دا)لێدوانەکەی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا زۆر کەسی قایل نەکرد ،بەتایبەتی هەواڵە دزە کردووەکان ئاماژەیان دەدا بەوەی (C.I.A) بڕی ٢٠ملیۆن دۆلاری بۆ ئەم داگیرکاریە خەرج کردووە!.

هەرلە پەنجاکاندا لەدوای جلەوی دەستەلات گرتنە دەستی (فیدڵ کاسترۆ) لەکوبا ،ئەمریکا و (C.I.A) گلانە دەست تێوەردانەوە لەکاروباری ناوخۆی کوبادا ... لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٦ز دا ،فیدڵ کاسترۆ بەهاورێیەتی ٨١ شۆڕشگێڕ گەیشتنە کوبا بەمەبەستی ڕزگارکردنی لەچنگاڵی دیکتاتۆر(فلجنسیو باتیستا)، لەساڵی (١٩٥٩ز)دا توانیان دەستەلات بگرنە دەست ،لەدوای سێ ساڵ لەشەڕی پارتی زانی لەدژی سوپاکەی باتیسا..

هەر لەسەرەتاوە وولاتە یەکگرتوەکان هەڵوێستێکی دژانەی نەگرتە بەر لەبەرانبەر شۆڕشەکەی کوباو شۆڕشە نوێکەیدا، بەڵام هەڵوێستە نەرمەکەی خۆی لەمەڕ کاسترۆ گۆڕی ،دوای ئەوەی کاسترۆ ئامادەباشی خۆی دەربڕی بۆ هاوکاری کردنی بزووتنەوە ڕزگاری خوازەکان لەئەمریکای لاتینی دا لەدژی ئەوسیستمە دیکتاتۆریانەی لەلایەن (واشنطن)ەوە پشتگیری دەکرێن .هەروەها لەپاش بڕیاری بلۆك کردنی سامانەکانی ئەمریکا لەکوبادا و بەستنی پەیوەندیش بەکامپی سۆسیالیستیەوە لەسەروشیانەوە یەکێتی سۆڤیەت ،هەرچەندە خودی کاسترۆ لەو ساتەدا شۆڕشی لەدژی (باتیستا) دەستپێکرد شیوعی نەبوو...

لەکانونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٩ز دا ،کولۆنیول(ج.س.کینگ)بەڕێوەبەری هەرێمی ڕۆژئاوا لە (C.I.A) دا ،پەیامێکی بۆ بەرپرسە باڵاکەی ئالن دالس دەنوسێت و تیایدا بەئاگای دەهێنێتەوە لەمەترسی کاردانەوەی شۆڕشی کوبا لەسەر ناوچەکانی هەرێمی ڕۆژئاوا. پێشنیاریشی کردبوو فیدڵ کاسترۆ لەنێو ببرێت وەك یەکەم هەنگاو لەسەرە ڕێگەی گۆڕینی ڕژێمی شۆڕشگێڕی لەکوبادا کەتەنها ٩٠ میل لەسنووری وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە دوورە ...

لەلایەنی خۆیەوە ئالن دالس پێشنیارەکەی کینگ ی پەسەند کرد،و کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ ئەندامانی (ئەنجومەنی ئاسیشی نەتەوەیدا) گرێ دا بۆ لێکۆڵینەوەی ڕەوشی کوبا

..ئەندامە کۆبوەکـان ڕێکـەوتن لـەسـەر پێکـهێنانی سـتافێکی تایـەت بـۆ لێکۆڵینـەوە لـەچۆنێتی ڕوخاندنی ڕژێمی فیدڵ کاسترۆ ی ڕابەری شۆڕشەکە.

سـەرۆك (ئایزنـهاوەر) لـەیاداشـتەکانیدا دەربـــارەی پێشـنیارەکان دەڵێـت :(لــە ١٧/٣/١٩٦٠دا ، فەرمانم دا بە (C.I.A) بۆدامەزراندنی کامپی ڕاهێنــانی پـەناهێندە کوبیەکان لــەگواتیمالادا ،بـەئامانجی ئـەوەی ڕۆژێـك بگەڕێەنـەوە نیشـتمانی دایکیـان (کوبا).)هەروا لـەمیانەی خوێندنەوەی یاداشتەکان دا دەردەکەوێت ئایزنهاوەر بەشداری کۆبوونەوەکەی ئەنجومەنی ئاسایشـی نەتـەوەیی و (C.I.A) بـووە،لـەکاتێکدا ئامـادە بـووان مەسـەلەی تـیرۆر کردنـی (فیـدڵ کاســترۆ)و براکــەی (ڕاووڵ)و هــاوڕێ ئەرژەنتینیەکەیان (جیڤارا)یان تاوتوێ دەکرد. هەنگاوی یەکەم لەبەرنامەی ڕووخــاندنی ڕژێمی شۆڕشگێڕی کوبا،بریتی بوو لەشێواندنی ناوبانگی کاسترۆ لــەنێوان لایـەنگرانی دا و ، بەکەم نیشاندانی خەسڵەتە پیاوانەکانی و ئەو سەقامگیریەی لەناو هاوڵاتیـەکانیدا پێی دەناسرێت ... بۆیە ،(C.I.A)جەنگێکی (شەڵم کوێرم ناپارێزم)انەی دژ بەکاسـترۆ دەست پێکرد، چەندین شێوازی منداڵانەی گرتە بەر بۆ ئـەوەی کاسـترۆ وەك شـێت و تێکچوو نیشان بدات یەکێك لـەو ڕێگایانە ،بریتی بوولـەدانانی بێ هۆشکەری کیمیـایی (L.S.D)لــە سـتۆدیۆی تەلـەفزیۆنی کووبـیدا،بەرلـەژوانی ووتـاردانێکی کاســـترۆ بەجۆرێك مادەکە کار لەهەڵسوکەوتو هاوسەنگی ئەقڵی کاسترۆ بکات لەسـاتی وتـار دانەکەدا ،بەڵام ئەم هەوڵە بێ سودبوو لە کاتێکدا بـەکرێگیراوانی (C.I.A ) نـەیان توانی کارایی مادده بێ هۆشکەرەکە بپارێزن لــەکاتی دانـانی دا لەسـتۆدیۆ،ڕێگەیـەکی دیکەی منداڵانــە ،لەخولـگـەی کوشتنیکاسـترۆدا دەخولایـەوە بـەهۆی جگەرەیـەکی ژەهراویەوە،بەڵام(C.I.A)دەست بەرداری ئـەم بیرۆکەیـەش بـوو لــەکاتێکدا بـەکرێ گیراوەکانی شکستیان هێنالەگەیاندنی جگەرە ژەهراویەکە بەدەمی کاسترۆ ...سـێیەمین پلانــی منداڵانـەی (C.I.A) هـەوڵدان بـوو بۆ جیاکردنـەوەی کاسـترۆ لــە ڕیشــە بەناوبانگەکــەی بــەهۆی خوێــی (ثـاليوم)ەوە کەمادەیــەکی (فلزیــە)ەو زۆر لــە

(قورقوشم)دەچێت...بڕیار بوو هەندێك لەم مادەیە بکرێتەقۆندەرەکانی کاسترۆوە لەکاتی سەردانی دا بۆ هەندەران و دابەزینی لە ئوتێلێکدا ،چونکە ئەم مادەیە دەبێتە لابەری موو لەکاتێکدا بەرهەر بەشێکی پێست بکەوێت...ئەم پلانەش هەڵوەشایەوە بەهۆی ئەوەوە کاسترۆ بۆماوەیەکی دوورو درێژ هەموو سەردانێکی بۆ هەندەران راوەستان .بەڕاستی جێگەی سەرسوڕمانە ئاژانسێکی جیهانی (وەك (C.I.A) )کەخۆی بەئاژانسی پیشەوەر و کارامەکان دەزانێت لەبواری سیخوری‌دا هەوڵبدات کردەوەی ئاوابێ ئەرزش جێبەجێ بکات.(C.I.A) دەستبەرداری هەوڵەکانی نەبوو کەبۆ تیرۆر کردنی کاسترۆ و دوو هاوەڵەکەی وەگەڕی دەخست ،لەتەمموزی (١٩٦٠)دا ،بەکرێگیراوێکی کووبی هەواڵی دا بە بەرپرسە باڵاکەی لە (C.I.A) دا کەبەزووترین کات پەیوەندی دەکات بەتۆڕێکی زۆر نزیکەوە لە (ڕاووڵ کاسترۆ)ی برای فیدڵ کاسترۆ ،ئەوەبوو بەرپرسانی (C.I.A) ئەرکی تیرۆرکردنی ڕاووڵیان بەهەمان بەکرێ گیراو سپارد هەرکاتێ بواری بۆ ڕەخسا . بەکرێگیراوەکە لەکۆتا چرکەکانی جێبەجێکردندا دەستی لەئەرکەکەی هەڵگرت و هەوڵە تیرۆرکاریەکە بۆماوەیەکی تر دواخرا ،لەڕاستیشدا پلانەکانی (C.I.A) لەم سنوورەدا نەوەستا بەڵکو تیرۆرکردنی فیدڵ کاسترۆ بۆماوەیەکی دوور و درێژ ببوە خولیای ئەم دەزگایە لەکۆتاییدا ئاژانسەکە ناچار بوو مافیای جیهانی بۆ تیرۆر کردنی کاسترۆ و هەردوو هاوەڵەکەی بخاتە کار...

لەم ڕووەوە (ڕۆبەرت ماهۆ) دیاری کرا بۆجێبەجێ کردنی ئەرکەکە بەچاو پۆشین لەوەی پەیوەندی لەتەك مافیا دا چ ئاسەوارێکی نێگەتیڤی لێدەکەوێتەوە ،زۆرینە بیروبۆچوونەکان پێیان وایە جێگری بەڕێوەبەری پلان دانان لە (C.I.A)دا(ڕیتشارد بیسل) لەپشتی ئەم ئەرك پێسپاردنەوە بوویێت.دەست بەجێ لەدوای وەرگرتنی فەرمانی ئەم ئەرکە (ماهۆ) لەتەك (جۆن ڕوسیل)ی بەڕێوەبەری دەزگای مافیا لە (لاس فیگاس)کۆبویەوە و بەڵێنی پێدا (١٥٠,٠٠٠)دۆلاری بۆ سەرف بکات گەر بێت و

فیدڵ کاسترۆ تیرۆر بکات ... هەروەها دەستی کردبـووە ڕاڤـە کردنـی هۆکارەکـانی تیرۆر کردنەکـەو وای حـاڵی کردبـوو کەکارتڵـە ئەمریکیـەکان لـەپێناوی بەدەسـت هێنانەوەی سامەنە بلۆك کراوەکانیاندا لەکوبا دەیانەوێت (فیدڵ کاسترۆ)تیرۆر بکەن .

ئاسایی (روسیلی)ئەم ڕاڤەکاری و گێڕانەوانەی بەهەند نەگرت ،چونکە مـاهۆ پێشـتر لەنوسینگەی لێکۆڵینەوە فیدراڵیەکان بـووە،لەبـەرژەوەندی(C.I.A)کـاری کـردووە لەکاتێکدا فلیمێکـی ئیبـاحی لەسـەر پەیوەندیـەکانی سـەرۆکی پێشـووی ئەندەنوسـیا (سوکارنۆ)دەرکردووە،لەگەڵ ئەوەشدا ڕوسیلی بڕیاری دا بەدووی ئەرکەکەیدا بچێت بەچاو پۆشین لەو لایەنەی لە پشتیەوە دەوەسـتێت ،لەبـەر ئـەوە ڕوسـیلی دوو پیـاوی بانگ کرد ،دوو پیاوەکە یەکێك بوون لەگرنگترین ئەوکەسایەتیانەی دادگای ئـەمریکا داوای دەکـردن ،دووپیاوەکـە یـەکێکیان ڕابـەری مافیـای ئـەمریکا (سـام جینکانـا)و بەڕێوەبەری مافیای کوبی (سانتوس ترافیکانتی)،و ئەرکەکەی بۆشی کردنەوە و لەو بڕە پارەیەش بۆ جێبەجێ کردنی تەرخانکرابوو ئاگاداری کـردن ،لـەدوای ئـەوە بەرپرسـی پەیوەندیەکانی (C.I.A) کە بەڕێوەبەری بەشی (کردەوەکانی یارمـەتی دان)ە بـەناوی (جیمس اوکونیل)لەگەڵ ئەو دووپیاوەدا کۆبوونەوەی گرێـدا ،هەرچـەند زۆر باشـیش ئاگای لەتۆماری دادگای هەردوکیان بوو ،چونکە (C.I.A) لەوکاتەدا گوێی نـەدەدا بـەداد و قـەزاو گیروگرفتـەکانیان ،سـەرەڕای نـاڕەزایی نوسـینگەی لێکۆڵینـەوە فیدراڵیەکان ،درێژەی دا بەمامەڵەکانی لەگەڵ ئەو دووپیاوەی مافیادا .

لەکاتێکی تردا مافیا هەستا بە چەند هەوڵێکی تـر بۆتـیرۆر کردنـی کاسـترۆ،بـەهۆی ژەهری کووشندەوە لەڕێگەی یەکێك لەیاریدەدەرەکانیەوە کە لەو چیشتخانە کوبیـەدا کاری دەکرد کە هەمیشە کاسترۆ نانی تێدا دەخـوارد ،(C.I.A )خوازیـاری ئـەوەبوو بەکرێگرتەکەی مافیا بتوانێت بەبەکارهێنانی گۆشتی خراپ بوو وماسی ژەهراویەوە لە ئامادەکردنی خواردنەکەی کاسترۆدا ئەو پیاوە تیرۆر بکات ،بـۆوەی مردنەکـەی کـت وپڕنەبێت و بەپلان ڕێژکراو لەقەڵەم نەدرێت ،وەڵێ ئەم بیرۆکەیەش شکستی هێنـا پـاش

ئـەوەی کاسـترۆ چیـدی لـەو چێشـتخانەیە نـانی نـەدەخوارد ،دەمێـك (جون.ف.کنیـدی)هـەڵبژێررا بـۆ پۆسـتی سـەرۆکی وولاتەیـەکگرتووەکانی ئـەمریکا لەتشرینی دووەمـی ۱۹۶۰دا ،هـێزی پەنابـەرە کوبیـەکان لـەگواتیمالا کۆتاییـان بـە ڕاهێنانەکانیان هێنابوو ،یارمەتیـەکی دارایشـیان بـۆ سـەرف کـرا بـەبڕی (۱۳ملیـۆن دۆلار)کەسەرۆکی پێشو ئایزنهاوەر ئیمـزای لەسـەر سـەرفکردنی کردبـوو لەتشـرینی یەکـەمی هـەمان سـاڵدا،هەرلەهـەمان مـاوەدا (C.I.A) ئـەرکی ڕاهێنـانی هـەندێك لەپەنابەرە کوبیەکانی بەجێگـەیاندبوو ،لەسـەر بـەکارهێنانی فڕۆکـەی (B26)لەسـەر دەستی پیاوانی (پاسەوانی نیشتمانی) لەویلایـەتی (ئالابامـا)ی ئـەمریکیدا ... کـەمێك بەرلەهـەڵبژاردنی سـەرۆك کنیـدی زۆرینـەی ئەوانـەی دەسـتیان هـەبوو لـەگۆڕینی ڕژێمەکەی گواتیمالا دا ،لەئامادەباشی دابوون بۆ کوودەتایەکی دیکە لەکووبا ...

یەکێك لەوانە (دیڤید فلیبس)ی پسپۆڕی پروپاگەندە بوو،ئـەم ئیسـتگەیەکی ڕادوێـی نوێی دامەزراند لەدوورگەی سوان ینزیکی هیندوراس بۆ تەغتیەکردنی کردەوەکەی کوبا لەژێر شفرەی (شەپۆلی م.ج)دا ...و ئاراستەی حەرەمی زانکۆی میامی لەفلۆریدا کرابوو ...

لەڕوویەکی ترەوە (C.I.A) هەستا بەکردنەوەی زنجیرە سەنتەرێکی بازرگانی وەهمی لـەفلۆریدا دا ،وەك سـەنتەری چاپەمـەنی و چـەکی جـەنگی ،بـۆوەی پەردەپۆشـی چالاکیەکانی خۆیانی پێبکەن،وەڵێ خوودی کاسترۆ زۆر جار ڕای دەگەیاند کەبەئاگایـە دەربارەی هەوڵەکانی (C.I.A) بۆ تیرۆر کردنی ،لە واشنطنیش بەرپرسـان هەسـتیان بەنزیك بوونەوەی وادەی ئەو داگیرکردنەی کوبا کردبوو کە (C.I.A) پلان ڕێژی بۆ کردووە،لەهەمان کاتدا هەستیان بەڕەهەندە مەترسی دارەکانیشی دەکرد،بۆیە بەهـەموو شێوازێك هەوڵی دواخستنی کردەوەکەی کوبایـان دەدا ،نەخاسمەکـە خـودی سـەرۆك کنیدیش نیگەران ببوو بەرانبەر هەڵس وکەوتەکانی (C.I.A) لـەو ڕووەوە ،بەرپرسـان هـەوڵیان دا هاوکاریـە سـەربازیەکان کـەم بکرێنـەوە،بەتایبـەت هاوکاریـە سـەربازیە

ئاسمانیەکان ،لەپرۆگرامەکانی (C.I.A) لەمەڕ کوبا ئەوی پتر ترس و دڵەڕاوکێی بەرپرسانی بەرانبەر بەداگیرکردنی کوبا زیاتر دەکرد ،ئەو ڕاپۆرتانەی خوودی (C.I.A) بوو کەڕوونیان دەکردەوە زۆرینەی ڕای گشتی کوبیەکان لەگەڵ سەرکردە پەناهێندەکانا نیە ،وەلێ سەرەڕای ئەم ڕاپۆرتانەش(ریتشارد بیسلی)جیگری بەڕێوەبەری پلاندانان بەردەوامی دا بە پراکتیزەکردنی بەرنامەکەی لەمەڕدابەزاندنی ژمارەیەك لەپەناهێندە کوبیەکان لە(کەنداوی بەرازەکان)لەکوبا ،بۆ دەستبەکاربوون بۆ شۆڕشکردن لەدژی ڕژێمەکەی کاسترۆ.

لە ١٩٦١/٤/١٧ دا ،(١٣٠٠)جەنگاوەر گەشتنە کەنداوی بەرازەکان بەهاوڕێیەتی کەشتی دەریاوانی ئەمریکی و شەش فڕۆکەی جەنگی ئەمریکی لەجۆری (B26)، بەگەشتنیان بۆ کەنداوەکە لەژێر باڵی هێرشە ئاسمانیەکان و بۆمبارانی تۆپە قورسەکاندا،جەنگێکی سەخت لەنێوان ئەمان و لایەنگرانی کاسترۆدا ڕووی دا کەبوویە هۆی دەستگیرکردنی و لەناوبردنی سەرجەم هێرشبەرەکان (بەژمارەیەك لە ئەمریکیەکانیشەوە) ، کاسترۆش وەك فەرماندەیەکی‌نیشتمانی دەرکەوت کەکوبا شیاوی بێت لەبەرگریکردن لەزەویەکانی ،سەرەڕای تێوەگلانی ژمارەیەك لەسەرکردایەتیە سیاسیەکان لەکردەوەکەی کوباو دڵە ڕاوکێی هەندێکی تریان لەهەڵبژاردنی هەڵوێستێکی ڕوون لەمەڕ ئەو مەسەلەیە ،کەچی بەتەنها بەڕێوەبەری (C.I.A) ئالن دالس بوویە کۆچی قوربانی شکستە کتوپڕیەکە،ئەوەبوو لەتۆڵەی شکستیەکەیدا ،سەرۆك کنیدی ئەمی لەکار لاداو لەجێگەیدا (جۆن.أ.مکون)ی دانا لە(١٩٦١/١١ز)دا ،وەك کاردانەوەیەکیش بەرانبەر شکستەکەی کوبا ،سەرۆك کنیدی دەستەلاتەکانی (C.I.A) بەرتەسك کردەوە،بارەگای سەرەکیشی گواستەوە بۆ ئەم جێیەی هەنووکە تێیدایە و دەکەوێتە ناوچەی (لانفلی)یەوە لەویلایەتی (فیرجینیا)،ناوچەکەش هێندە چڕە داروردەختە هەڵچوەکان بینایەی (C.I.A) دادەپۆشن و لەچاوی ڕێبوارانی ئەو دەڤەرەی گومشار دەکەن .

وەك ئەدەب دادانێکیش کۆنگرێس لەپاشدا تەنها (٤٧ملیۆن دۆلار)ی بۆئەم دەزگایە سەرف کرد بێگوومان کردەوەکەی کوبا جێ پەنجەی دیار بوو بەسەر دەروازەی چوونە ژورەوەی ئەم بینا تازەیەشەوە ،کەئەم درووشمە کاریگەرەی لەسەر نەخشێنرابوو...(کە پەیت بەڕاستی برد ، پەی بەدەروازەکانی سەربەستی دەبەیت) سەرنج دەدەین ئەم درووشمە کۆتای هەنگاوەکان نەبوو یەکێتی سۆڤیەت ئەوحاڵەتە سیاسیەی قۆستەوە کەلەنێوان (کوبا) و (وولاتە یەکگرتووەکان)دا سەری هەڵدا بوو ،ئەوەبوو قایل مەندیەکی کاستڕۆی دەستگیر بوو سەبارەت بە دامەزراندنی لقێکی مووشەکی ئیستراتیژی لەسەر زەوی دوورگەی کوبای نزیك سنورەکانی وولاتە یەکگرتووەکان ... ساڵی ١٩٦٢،دەیان تەکنیکی و پسپۆری سۆڤیەتی گەیشتنە کوبا، دەستیان کردە دامەزراندنی سەکۆی مووشەکی بالستی مامناوەندیەکان ،لەهەمان کاتدا (مۆسکۆ) مووشەکی جۆری(SA.2)ی بەخشیە ڕژێمی کوبا ، کەدژبەفڕۆکەیە سەرەڕای موشەکی بەرگری دیکە . وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا توانی زانیاری دەست خۆبخات لەسەر جموجووڵەکانی سۆڤیەت ، بەهۆی سیخوڕی ئاسمانیەوە کەفڕۆکەکانی جۆری (U.2)ی سەربە (C.I.A) پێی هەڵدەستان لەماوەیەکی پاشتردا وێنەئاسمانیەکان دەریان خست کەسۆڤیەتیەکان توانیویانە سەکۆی بزواو بۆ مووشەکە بالستیەکانیان دابمەزرێنن کەدەتوانن کردەوەی هێرشی بەرانبەر لەدژی زەویەکانی ئەمریکا جێبەجێبکەن ،هەردەست بەجێ لەدوای دەستگیر بوونی ئەم زانیاریانە ئیدارەی ئەمریکا لە(٢٢/١٠)دا کۆبونەوەیەکی گرێدا لەتك ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی و (C.I.A) دا بۆ تاو وتوێکردنی کۆتا پێشهاتە سەربازیەکان ،ئەوەبوو سەرۆك کنیدی ڕای گەیاند ،لەدوای دەستکەوتنی ئەوزانیاریانە لەسەر تۆڕە مووشەکیە سۆڤیەتیە هێرش بەرەکان لەکوبادا ،ئیدارەی ئەمریکا بڕیاری دا ئابلۆقەیەکی سەربازی بسەپێنێت بەسەر کوبادا بۆ ناچارکردنی سۆڤیەت بەلەت و پەت کردنی ئەو سەکۆو تۆڕانە.. گەر سۆڤیەت ئەم ڕێگە چارەیە ڕەت بکەنەوە ئەوا ئەمریکا ناچار دەبێت

بۆلێك هەڵوەشاندنەوەی ئەوتۆڕە موشەکیانە گورزێکی سەربازی بسرەوێنێتە کوبا ،بەم هۆیەوەپەیوەندیەکانی نێوان (مۆسکۆ) و (واشنطن)هێندە ئاڵۆزبوو زۆرێك پێیان وابوو ،جەنگی نێوان دوو زەبەلاحەکە لەلێواری دەستپێکردن دایە، کەچی لە ١٠/٢٦ دا ڕابەری سۆڤیەتی (خرۆشۆف)ئاماژەی دا بەوەی ئامادەیی تێدایە سەکۆی موشەکەکانی لەکوبادا هەڵبوەشێنێتەوە بەمەرجێك پێش وەخت ئەمریکا ئابلۆوقەکەی لابەرێت و لەبەر دەم هەموو جیهانیش دا بەڵێنی ئەوە بدات کە کوبا داگیر نەکات یاخوود دەست لەکارووباری ناوخۆیی کوبا وەرنەدات ،لەپاشدا کنیدی بەداواکاریەکەی سۆڤیەت قایل بوو یەکێتی سۆڤیەتیش دەستی کردە لێك هەڵوەشاندنەوەی سەکۆ مووشەکیەکانی. لەکۆتاییدا پێویستە بێژین هەڵوێستە ئاشکراکانی کنیدی و سەرکەوتنی لەبەرانبەرکێی سۆڤیەتدا ،بێ ئەوەی پەنابەرێتە بەرکردەوەی پەنامەکی و خەیاڵی ، بوونە هۆی بەرتەسك کردنەوەی ئەرکەکانی (C.I.A) و هەوڵەمندالآنەکانی لەبەرانبەرکێی مەترسی کۆمۆنیزم و ڕژێمی نوێی کاسترۆ.

# ﴿ سیخورایەتی ئەوروپی ﴾

سەرەڕای دەستە بالآیی (K.G.B) و (C.I.A) بەسەر ڕۆلەکانی یاری سیخوڕیی و بەشەکانیدا ، کەچی دەزگا هەوالدەریە ئەوروپیەکانیش ڕۆلی هاوبەشێکی دلسۆزیان هەبوو لەوسیخووڕی و دژە سیخوڕیەی جیهانی تەنیبوو ،بەریتانیا بەتەنها خۆی پەیوەندیەکی باشی هەبوو لەگەل وولاتە یەکگرتوەکان لەم بوارانەدا ،ئەوەبو هەردوو لا لە سالی ١٩٤٧دا پرۆتۆکۆلێکیان ئیمزا کرد سەبارەت بە ئالوگۆڕکردنی ئەونامانەی لەڕێی بێ تەلەوە وەردەگیرێن و هاوکاری یەکیش دەکەن بۆ شیکردنەوەی جەفەنگەکانیان ،هەروەها هەردوو لایان ڕێکەوتن لەسەر بەستنەوەی (ئاژانسی ئاسایشی نیشتمانی )ئەمریکی لە (واشنطن)،بەسەنتەی پەیوەندی حکومی بەریتانی لە (شلتنهام)، بەهۆی هێلێکی بێتەلەوە کەهەمیشە لەکاردا بێت بۆئەوەی خێراییەك بدرێتە پرۆسەی گۆرڕینەوەی نامەکان لەسەر تەرزی ئەم پرۆتۆکۆلە هەریەك لە (ئوستڕالیا ، کەنادا ،نیوزلەندە)و سەرجەم وولاتە بەشداربوەکانی پەیمانی (NATO)هەستان بەئیمزا کردنی پرۆتۆکۆلێك سەبارەت بەئالوگۆڕکردنی زانیاری سیخوڕی و قەلاچۆکردنی پرۆسە سیخوڕیەکانی سۆڤیەت ...وولاتە یەکگرتوەکان ڕۆلێکی گرنگی هەبوو لە وەرگرتنی زانیاری وپەیامی بێ تەلی ئال وگۆڕکراو لەنێوان دەولەتانی سەربەکامپی کۆمۆنیستی دا بەهۆی مانگە دەستکردەکانیەوە ،مانگە دەستکردە سیخوڕیەکانی ئەمریکا بەجۆرێك پێشکەوتو بوون توانایان هەبوو گفتوگۆ تەلەفۆنیەکانی ڕابەرانی سۆڤیەت وەربگرن لەکاتێکدا بە ئۆتۆمۆبیلی دبلۆماسی هاتوچۆیان دەکرد ئەو ئۆتۆمۆبیلانەی ئامێری تەلەفوونی بێتەلی تێدایە بەرلەم ڕۆلە گرنگەی ئەمریکا لەبواری

سخورایەتی کردندا بەریتانیەکان خالّی پرشنگداریان تۆمارکردوە لەبواری سیخوڕی و زانیارەکاندا ،(سەنتەری پەیوەندیە حکومیە بەریتانیەکان)لــە هۆنــگ کۆنــگ بۆنمونــە ، زانیاری زۆر سوود بەخش و بەکەلّکی دەدایە وولاّتە یەکگرتوەکان لەساتە وەختەکانی جــەنگی ڤێتنــام دا . هــەروەها ســەنتەرێکی دیکـــەش کارئاســـانی کــەی کــرد بــۆ (واشنطن)لەپێناوی پەرە دانی بەکارەکانی (ئاژانسی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکی)و بنکە ســیخوڕیەکەی لــە تەپۆلّکــەی (مینــوث)ی ســەر بەکــەرتی (یورکشــایر)ی بــەریتانیدا .هەندێك لەپسپۆران پێیان وایە ئەو بنکەیە زەبەلاح ترین بنکــەی (تــەنصت)ە لەهــەموو گێتیدا.هیچ بوارێکیش نیە بۆ بــەراوردکردنی لەگــەلّ بنکــە سۆڤیەتیەکاندا شیاوی ئاماژە پێدانە بنکەی(مینوث)ی ئەمریکی ڕاستەو خۆ بەسراوەتەوە بەهێلّەکانی تەلــەفۆنی بەریتانیەوە ،ئەمەش یانی مسۆگەرکردنی زیاترین زانیاری و پەیامی هاتوی ئــەلکترۆنی و بیّ تەل لە ئەوروپادا،یــەکێك لــەتوێژەرەوانی (ئاژانســی ئاسیشــی نەتــەوەیی)لــەکۆتایی حەفتاکاندادەربارەی بنکەی (مینوث) دەبێژێت (بنکەیەکی گویّ هەلّخســتنی زەبەلاحــە توانــای گـــویّ هەلّخـــستنی هەیـــە بەسەرســـەرجەم هێلّـــە تەلەفونیەکانـــەوە لەئەوروپادا)...سەبارەت بەکردەوە هەوالّگریە کانی بەریتانیاش زۆرینــەی لەســەنتەری پەیوەندیە حکومیەکاندا بەڕێوەبراوە کەلە ئەوروپاو ناوچەکانی ژێر قەلّـــەم ڕەوی پــرژو بــلاّو بوونەتــەوە و زۆرینــەی کــات لەبــەرژەوەندی (M15)کارایــان کــردووە واتــە (ئاژانســی ئاسایشــی نەتــەوەیی بــەریتانیا )کەلــە ئــەمریکا (نوســـینگەی لێکۆلّینـــەوە فیدرالّیەکانFBI)لەبەرامبەردا دادەنرێت ،لێرەدا ڕەوایە ئاماژە بدەین بەوەی گروپێــك لەزانا بەریتانیــەکان ســەربە (ســەنتەری خزمــەتگوزار بــەزمانی _تەکنەلۆژیــەکان) بــەر لــەهەرگروپێکی زانستی تر توانی ئامێری کۆمپیوتەری تایبەت بەهەوالّگری بەکار بێنێت ، ئەم ئامێرە کۆمپیوتەریانە دەیان توانی لەماوەی پەیوەندی کردنە تەلەفۆنیەکاندا چــەند ووشەیەکی بەرنامە داری دیاری کــراو وەربگــرن و فــەرمان بدەنــە ئامێرەکــانی تۆمــار کردن تاکو پەیوەندیە تەلەفۆنیەکە تۆمــار بکــەن وسەرچاوەکەشــی بزانــن ، پێدەچێــت

بنکەی سەرەکی ئەم جۆرە کردەوە تەکنەلۆژیانە لە(شانتری هاوس)ی فکتۆریای بەریتانیا بێت ، لەکاتێکدا (سەنتەری گوێهەڵخستنی بەریتانی)جیهانی بارەگاکەی لەلندن ی پایتەختە وەلێ دەزگای هەوالگری بەریتانیا کات ناکاتێك دووچاری گورزێك بووە لەسەر ئاستی سیخوڕی ، بەتایبەت لەدوای دەستگیرکردنی (جوفری برایم)ی بەکرێگیراوی سۆڤیەت ،ساڵی (١٩٨٢)بەتۆمەتی دزەپێکردنی زانیاری لە سەنتەری پەیوەندیە حکومیە بەریتانیەکانەوە بۆ (K.G.B)، برایم لە (١٩٦٨)ەوە بۆ (١٩٧٧)لەوسەنتەرەدا کاری کردووە ، لەم ماوەیەدا توانیویەتی زانیاری تەکنەلۆژی و بێ تەلی بەکەڵك بداتە سۆڤیەتیەکان ،دەستگیرکرانەکەشی لەرێگای(M15) یاخود(M16)ەوە نەبوو بەڵکو بەرێکەوت بوو ئەوەبوو پۆلیسی ناوخۆیی بەتۆمەتی نێربازی گرتیان و ئەمەش ژنەکەی هاندا نهێنی کرێگرتەییەکەی بۆسۆڤیەت ئاشکرابکات !! .لەپاش لێکۆڵینەوەدەرکەوت کە (برایم)دووپەیوەندی ڕاستەوخۆی بەبەرپرسە باڵاکەیەوە لە (K.G.B)گرێداوە ، لەدوای دەست لەکار کێشانەوەی ساڵی ١٩٧٧پەیوەندی یەکەمیان ساڵی ١٩٨٠و لە(ڤیننا)وەکراوە و پەیوەندی دوەمیشیان ساڵی ١٩٨١و لەبەرلینەوە کراوە هەرچەندە دادگایی کردنە نهێنیەکەی برایم رێگەی نەدا چەندێتی و چۆنێتی ئەو زانیاریانە ئاشکرابێت کەبۆ (K.G.B) ناردووە ،وەلێ هەندێك لەپسپۆڕان پێیان وایە (برایم) زانیاری لەسەر پرۆژەیەکی سیخوڕی داوەتە سۆڤیەتیەکان کەناوی (بایمان)ی لێنراوە و بەهۆیەوە ڕۆژئاوا لەرێگەی مانگە دەستکردەکانەوە دەتوانێت دەنگ و ڕەنگی هەرچی چالاکیەکی سۆڤیەت (بەپێی خواستەکانی (C.I.A) و (M16)هەیە تۆماری بکات )هەروەها پێدەچێت زانیاریشی دەربارەی مانگی دەستکردی سیخوڕی (ئارگووس) دزیبێت کە لە حوزەیرانی ١٩٧٥ دا لەخولگەکەی خۆیدا دانرا لەپێناوی دۆزینەوەو وەرگرتنی لەرەلەرەکانی دەنگە بەشێوەیەکی رێك و پێك و وورد ، هەروەها دەگوترێت(ئارگووس)توانای تۆمارکردنی سەرجەم ئەو هەڤپەیڤینە بێ سیمانەی هەیە کەلەنێوان فەرماندەی (تانکەکانی)پەیمانی

(وارشۆ)دا گـرێ دەدرێ لەهـەموو بستە خـاكێكی سـەر بـەكامپی سۆسیالـستی دا ..سـەرەڕای ئـەوەش سـۆڤیەتیەكان بـەهۆی برایمـەوە توانیـان لەتەكنـەلۆژیای (ئا.ئا.نەتەوەیی)و (سەنتەری پەیوەندیە بەریتانیەكان)لەبوای كۆمپیوتەر و مانگە دەسـت كردەكـان دا شـارەزابن... بێگومـان ئەمـەش بویـە هـۆی تووڕەكردنـی (واشنطن)وئالۆزبوونی پەیوەندیە سیخوڕیەكانی لەتەك بەریتانیادا تاكو گەشتە ڕادەیـەك بەرپرسێك لە (C.I.A) دا، گووتی (زانیاری لەسـەنتەری پەیوەندیـە بەریتانیـەكان لـە شلتن هامەوە بەجۆرێك دزەی كردووە وەك چۆن زەیت لەداینە مۆیەكی كون دەڕژێت) دەستگیركردنی (برایـم)یەكـەمین ڕیسـوایی نەبووكـەدەزگای هـەواڵگری بـەریتانیای لەرزاندو پەیوەندیە باشەكانیشی لەتەك (C.I.A) دا ئـاڵۆزكرد ئـەوەبوو لەبـەریش دا هەردوو زانای ئەتۆمی (نانمای)و (كلاوس فوشـز)بەتۆمـەتی دزە پێكردنـی زانیـاری بـۆ سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٤٦و ١٩٥٠دا دەستگیر كران ، بەلام ئەم دەستگیر كردنەش بە ئەندازەی دەستگیركردنی هەردوو بەكرێگیراوی جووتە (برگس و ماكلین)كاریگـەری نەبوو ...ئەمریكیـەكان لـەدوای جیابوونـەوەی ئـەو دوو كارمـەندەو هەڵـهاتنیان بـۆ (مۆسكۆ) لەساڵی ١٩٥١زدا هەموو متمانەیەكی خۆی بەدەزگای هەواڵگری بـەریتانیا لەدەست دا. بەگوێرەی گووتەی ئاگایانی ڕەوشەكە ،هۆكاری دزە كردنە نێو دەزگـای هـەواڵگری بـەریتانیا دەگەڕێتـەوە بـۆ تەبـەنی كردنـی بـیردۆزی ماركسـیزم لەلایـەن ژمارەیەك لە ڕۆشنبیرە بەریتانیەكانەوە و كاركردنی ئەو ڕۆشنبیرانە بۆهاوكاری كردنـی سـۆڤیەت لـە پێنـاوی پراكتیزەكردنی بیردۆزەكـە لەئاسـتی جیـهانی دا. لـەنێو ئـەو ڕۆشنبیراندا گروپێك لە قوتابیـانی زانكـۆی (كامبریدج )ی بـەریتانیا هـەبوو لەوانـە [illegible] ماكلین، گای برگس، كیم فیلبی، وهاوڕێـە بەتەمەنترەكـەیان ئـەنتۆنی بلانت [illegible] جەنگی جیهانی دووەم دا ئەو چوار ڕزاكبیرە توانیـان بگەنـە چەندین [illegible] لە بەریتانیادا [illegible] دیپلۆماسی و سیخوڕیدا، بلانت لە (MI5)[illegible] ئاسایشی نەتەوەیی)دابوو، فیلبی لە (M16) (موخابەراتی

( ئەمە خانووی (مۆریس و لۆناکۆهین ) ە کە پاشتر بە ( بیتر و ئیلین کرۆگر ) ناسران ، لەم خانووەوە و لە فرۆشگەیەکی کۆنە کتێب فرۆشتن دا ئەو دوو بەکرێ گیراوە تۆڕی بۆرتلاندی سیخوڕییان لە بەرژەوەندی سۆڤیەت بەڕێوە دەبرد ) .

بەریتانیا)و دوانەکەی دیکەش لەدەزگای تایبەتی‌دا بوون، کەلەتەوەری (M15) و (M16)دا دە خولانەوە.

بلانت لەلای خۆیەوە ،لەساڵی ١٩٤٥دا لەکاری سیخوڕی کردن پەرێزی گرت ،پاش ئەوەی زانیاری بەهاداری سەربازی زۆری بۆ سۆڤیەت وە دەست خست لەماوەی جەنگی جیهانی دووەم دا ولەکاتێکدا فیلبی و ماکلین لەسەر پیشەکەیان یەکبینەبوون تاکو گەیشتنە سەنتەرە هەستیاریەکانی سیخوڕی ،یەکەمیان بویە نێوەندگیر لەنێوان(M16) و (C.I.A)دا لە (واشنطن)(گای بیرگس)ی بەکرێگیراوی چوارەم نێربازو مەیخۆربوو بەڕادەیەك ئەو ڕەوشتەی ڕێگربوو لەبەردەم ئەوەدا بگاتە سەنتەرێکی گرنگی دار لە موخابەراتی بەریتانیادا ،بەڵام لەگەڵ هاوەڵەکەیدا (دونالد ماکلین)

کەئەمیش نێربازبوو هەڵات ،دوای ئەوەی ئـەمی دووەم بڕیـاری دا بـەرەوە (مۆسـکۆ) هەڵبێت ،چونکە بەنهێنی پێی ڕاگەیەنرابوو کە ڕووبەڕوی لێپرسینەوەی (M16)دەبێـت سەبارەت بەو تۆمەتانەی دەخرێنە ئەستۆی لەمەڕکارکردنی لەبەرژەوەندی سۆڤیەت.

بـەو شێوەیە هـەردوو بـەکرێگیراو (برگـس و مـاکلین) بۆماوەیـەك لـەکیشـوەری ئەمریکادا بزر بوون ،پاشـتر لـە(مۆسـکۆ)ی خۆشەویسـتدا بەدەرکـەوتن... هـەروەها دەگوترێـت مـاکلین دەستنیشـان کـرا وەك نوێنـەری بـەرتانیا لەلیژنـەی هاوبەشـی پەرەپێدانی ئەتۆمی لەنێوان (واشـنطن)و لـنـدن دا ،وە (کیـم فیلبـی)هـاوڕێی لـەگرتن ڕزگاری کرد،دوا. ئەوەی برگـس و بلانـت ی خانەنشـین کـراو هـەواڵیان پێدابـوو کـەجیمس ئـەنگلتون ی گـەورە پیـاوی (C.I.A) داوای دەسـتگیرکردنی کـردووە بەتۆمەتی بەکرێگیراوی وەڵی لەدوای هەڵاتنی ماکلین و برگس ،گومان دەربارەی کیـم فیلبی زیادی کرد ،بەتایبەتی کەلە (واشنطن) پێکەوە لەیـەك مـاڵدا دەژیـان ،هـەروەها (C.I.A) داوای لە (M16)کرد کەدەست بـەجێ فیلـبی لـە (واشـنطن)بگوازنـەوە ،وەگـەر نـا ئاژانسـەکە ناچـار دەبێـت پەیوەندیـە مەعلوماتیـەکانی لەگەڵ دەزگـای موخابەراتی بەریتانیادا بپچڕێنێت ...لەکاتێکدا (M16)سەرجەم تۆمەتـەکانی دەرهـەق بە (فیلبی)بەپووچ و بێ ناوەڕۆك دایە قەڵەم ،چونکە ئـەم پیـاوە توانیبـوی موخابـەراتی بەریتانیا هەڵخەڵەتێنێت لەڕاستی کرێگرتەییەکـەی بـۆ سـۆڤیەت ...بـەڵام لـەکۆتاییدا سەنتەرە هەستیارەکەی خۆی لە (واشنطن)لەدەست داو هەستی دەکـرد هێـدی هێـدی موخابەراتی بەریتانی دەستبەرداری خزمەتەکانی دەبێـت ،بۆیەسـاڵی ١٩٦٣بڕیـاری دا بەرەو سۆڤیەت هەڵبێت ،بۆوەی لەوێندەرێ دەست بەکارێکی نوێی موخابەراتی بکـات ،ئەوەبوو بوویە ڕاوێژکاری سـەرۆکی بەڕێوەبـەری (K.G.B)لەوکاتـەدا،لەدوایشـدا بوویە ڕاوێژکاری (یۆری اندروبوف)ی سەرۆکی سۆڤیەت...

لەسەر ئاستی ئەو خورپە سەر شـۆڕکەرانەی لەشەسـتەکاندا دووچـاری موخابـەراتی بـەریتانیا بوونـەوە،ڕاکردنـی بـەکرێگیراوی دووسـەرە (جۆرج بلایـك) لــەزیندانی

موخابەراتی بەریتانیای ناسراو بە (درەختەکانی کرمی تەختەیی)...لەدوای پێنج ساڵ لە دەستگیرکردنی، بلایکی شیوعی توانی هەڵبێت لەساڵی ١٩٦٦زدا ،ڕاستەو خۆ چووە (مۆسکۆ) ،ئەم پیاوە بەر لە دەستگیرکردنی لەساڵی ١٩٦١زدا ،ماوەی دەساڵ کاری لەبەرژەوەندی (K.G.B)کردبوو ،دەڵێن گوایە لەدوای ئەوەی سوپای کۆریای باکور لەساڵی ١٩٥١ز دا دەستگیریان کردووە،بوەتە شیوعی ،لەماوەی جەنگ دا ،لەوێندەرێ ماوەیەك بەسەر دەبات و لەلایەن پاسەوانە شیوعیەکانیەوەمامەڵەی باشی لەگەڵدا دەکرێت ،لەلایەکی ترەوە گەر گووتەکانی (M16)وەڕاست بگێڕین (بیتروایت)،ئەوا هەست دەکەین (C.I.A) گەشتۆتە قەناعەتی تەواو بە پچڕاندنی پەیوەندیەکانی لەگەڵ موخابەراتی بەریتانیادا ،دوای ئەوەی (C.I.A) هەستاوە بەئاشکرا کردنەوەی ناوی هەندێك لەبەکرێگیراوەکانی (M15 و M16)وهەندێك لەپیاوانی سەنتەری پەیوەندیە بەریتانیەکان ،لەپاش ئەو ئاشکرا کردنەوانە گەشتە بەرەنجامێك گوایە موخابەراتی بەریتانیا جێگەی متمانە نیەو بەرەهایی نابێت مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت ...هەروەها لەبەریتانیاش (K.G.B)لەمیانەی ژنە بکرێگیراوەکەیدا (رودولف ابل)ڕۆڵێکی کاریگەرو گرنگی گێڕا ،ئەم ئافرەتە توانی (موریس کۆهین)ی شیوعی ئەمریکایی و (لۆنا)ی خێزانی قایل بکات سەفەر بکەن بۆ فەرەنساو لەوێ ناوی (بیتر و أیلین کروگر)لەخۆیان بنێن ،کە دووهاولاتی نیوزلەندی بوون و پێشتر مردبوون ... موریس کۆهین و ژنەکەی ڕێگەی (کەنەدا، سنگافورا، یەکێتی سۆڤیەت، نەمسا ، فەرەنسا) یان گرت بۆ وەدەست کەوتنی پاساپۆرت بەناوی دووهاوولاتیە مردووە نیوزلەندیەکەوە ...دەست بەجێ کەپاساپۆرتە تازەکەی دەستکەوت ،کابرای شیوعی ئەمریکی کەناوی لەخۆی نا (بیتر کروگر) وژنەکەی پێکەوە چونە (بەریتانا)و دەستیان کرد بەکاری سیخوڕی کردن لەژێر چاودێری بەکرێ گیراوێکی سۆڤیەتی دیکە بەناوی (گۆردن لونسدال)(ناوی ڕاستەقینەشی ترۆفیمۆ فیتش مولودی)یە ...بەهەماهەنگی لەتەك (لۆنسدال)دا تۆڕێکی سیخوڕی سەرکەوتویان دامەزراند ،(١٩٥٦)ەوە تاکو

(١٩٦١)كاری دەكرد لەبەرژەوەندی (K.G.B)،بەهاوكاری (هاری هوتن) ،ئـەمیش بەكرێ گیراوێكی تر بوو پۆسـتێكی گرنگـی لـە (دامـەزراوەی ژێـر دەریـایی)ەكـاندا لەناوچەی (بورتلاند)ی بـەریتانی داگـیركردبوو ،بـەلاّم ئەندامانیئـەم تـۆڕە ،بـەجۆرج بلایكیشەوە ،دەستگیر كران لەدوایجیابوونەوەی(أنا تـۆلی گولیتـین)ی بـەكرێگیراوی سۆڤیەت و هەلاّتنی بۆ ڕۆژئاوا ...گولیتین كاروبارەكانی ئەم تـۆڕەی ئاشـكرا كـرد و ناوی ئەندامەكانیشی ئاشكرا كرد ،ئەمان ماوەیەكی كەمیان لەزینداندا گوزەراند ئینجـا لەپرۆسەیەكی گۆڕینەوەی سیخوڕەكاندا لە خالّی پەڕینەوەی نێوان بەرلینی ڕۆژهەلاّت و بـەرلینی ڕۆژئـاوادا درانـەوە دەسـتی سـۆڤیەت ... هـەندێكی تـر دەلێـن نـهێنی سەركەوتنی دزەكردنی سۆڤیەت بۆنیو موخابەراتی بەریتانیا دەگەڕێتەوە بـۆ ئەوڕۆلـەی بەڕێوەبـەری (M15)(سـیر ڕۆجـر هۆلـز)لـە نێـوان (١٩٥٦-١٩٦٥)دا وازی دەكرد،ئەم بەرپرسە كەلە هەمان كاتدا بەكرێ گیراویش بووتوانی ،كیم فیلبی ،گوردن لونسدالّ ،بلانت....هتد.

بپارێزێت لەتۆمەتەكانی (C.I.A) و چاودێری بۆسەوانەكان ئاماژە دەدرێت بـ،وەی بلانت بۆنمونە دادگایی نەكرا، سەرەڕای ئەوناپاكیەی كەلەلای هەمووان ئاشـكرایە ... لەهەمان ڕووەوە ،ئاگایانی نهێنیەكانی دزەكردنی سۆڤیەت بۆنێـو موخابـەراتی بـەریتانیا ئاماژە دەكەن بەوەی ناكۆكیە تووندو تیژەكانی نێـوان(M15) و (M16) هۆكـارێك بوون لەهۆكارەكانی سەركەوتنی ئـەم دزەكردنـە، قسـەو قسـەلۆك و ئـەو تۆمەتانـەی دەخرانە پالّ (هۆلز گوایە )بەكرێگیراوی سۆڤیەتە .لەوانەیە تۆمـەتباركردنێكی پـووچ و پالاّنتەیەكی بەتالّ بن و بەرپرسانی (M16)دروستیان كردبێت بـۆ لەكـە خسـتنە پـالّ (M15)،هەمان ئەگەریش بەسەر ئەوتۆمەتانەدا ئەبرێت كەبەرپرسانی (M15) دەرهەق بە بەرپرسی (M16)"سـیرموری اولدڤیـل" (١٩٧٤-١٩٧٨) ڕایـان گـەیاند...وەلیّ (موریس) لە دوای ئەو پۆستە بەرزكرایەوە بۆ پۆستی (ڕێكخەری هێمنایەتی ئێرلـەندەی باكور)سالّی ١٩٧٩... لەلایـەكی تـرەوە دزە كردنـی سـۆڤیەت بۆنـاو موخابـەراتی

بەریتانیا بویە هۆی هەڵمەتێکی پەرلەمانی توند و تیژ لەدژی (M16)و کردەوەو چالاکیە سەربەستانەکانیدا ، کەلە ڕووی یاساییەوە پارێزراوە بە (مەرسومی نهێنیە حکومیەکان)،چون(M16) بەرەسمی بونی نیە و پەرلەمانی بەریتانیا پەیوەندی بەکارەکانیەوە نیە ،وەڵێ ئەدرەسی بارەگا سەرەکیەکەی لای هەمووان ئاشکرایە نەخاسمە لای شۆفێری ئوتوبیسە گشتیەکان کەڕۆژانە بەوێدا تێدەپەڕن ،شیاوی باس کردنە کە شۆفێری ئوتوبیس و ئۆتۆمبیلە گشتیەکان بارەگاکەی (M16)یان ناونـاوە وێستگەی سیخوڕان بەبەراورد لەگەڵ ئاشکرایەتی (C.I.A) ی ئەمریکی و پەیوەندی لەگەڵ کۆنگرێس دا ئەوا دەردەکەوێت کە(M16)دەزگایەکی زۆر نهێنیەوە دوور لەلێپرسینەوەی پەرلەمانی بەریتانیا کاردەکات هەروەها دەگوترێت بودجەی (M16) و (M15)و سەنتەری پەیوەندیە بەریتانیەکان سالآنە پترە لە (٤٠ملیۆن جونەیی بەریتانی)،سەرەڕایی ئەو ڕۆڵانەی (M16)وازی دەکات و لەڕووی یاسایەوە دانی پێدانەنراوە...

وەلەسەر ئاستی چالاکیە سیخوڕیە ئەوروپیەکان موخابەراتی (پۆلۆنی)ناسراو بە (UB)سەرکەوتنێکی بەرجەستەیان لەنێوان سالآنی ١٩٥١-١٩٦٧دا بەدەست هێنا بەهۆی یەکێك لەبەکرێگیراوەکانیەوە بەناوی (لینوسکی)توانی دووکەسی ئەڵمانی ڕۆژئاوایی بۆ خۆی بێنێتە ژێربار ،یەکێکیان (خەلەبان)بوو لەفڕگەی (زیل)ی ئەڵمانیای ڕۆژئاواو ناوی (وولف نوب)بوو،دووەمیان کارمەند بوو لە کۆمپانیایەکی فڕۆکەوانی مەدەنی و ناوی (مانفرید رامینگر)بەکرێگیراوی پۆلۆنی هەرلەسەرەتاوە سەرکەوتو بوو لەدزینی قووتویەکی ڕەشی موولکی فڕۆکەی (لیتون.ئێل.ئێم) و فڕاندنی بۆ موخابەراتی پۆلۆنیا هەروەها هەوڵی دا فڕۆکەیەکی (ڤانتۆم)لەبنکەی (زیل)ی ئەڵمانیا بفڕێنێت و بیداتە دەست سۆڤێت .بەڵام دوای ئەوەی دوچاری چەند کۆسپ و تەگەرەیەك هاتەوە دەستبەرداری ئەم ڕایەی بوو ، ناچار پلانەکەی گۆڕی بۆپلانێکی تر کە ئامانجی ڕفاندنی ڕۆکێتی (جو-جو) جۆری ((AIM-9E))بوو.

بـــەهاوکاری فرۆکـــەوان (نـــوب)کـــەکارتێکی گوزەرکردنی‌دیکـــەی بـــۆ (لینوسکی)دەستەبەر کردبـوو ڕێنمایشـی کردبـوو بـۆ گەنجینەیـەکی ڕۆکێتـی (جـو-جو)ئەمی دووەم توانـــی یـەك ڕۆکێـت بدزێـت بـۆ شـوقەیەك لـەدووری (۲۰۰میـل) لـەبنکەی زیلـەوە .ڕۆکێتەکەی پارچە پارچە کـردووە لـەسندوقی ئامـادەدا بـۆ ڕەوانـە کردن بەرەو (مۆسکۆ) دایناوە لـەسنووقەکانی نوسیوە (عينات تجارية)..

لەفڕگەی (دوسلدروف)ی ئەڵمانیای ڕۆژئاواوە ڕۆکێتەکە ڕەوانەی (مۆســکۆ) کـرا لە ڕێی (کوبن هاگن)ەوە ،بەهــەمان ئـەو فڕۆکەیـەی کـە (ڕامینگـر)ی بـەکرێگیراوی ئەڵمانی بەکرێی گرتبــوو بـۆ ئاسـان کردنـی تەسـلیم کردنـی ڕۆکێتەکـە ڕاسـتەوخۆ بە(K.G.B).

بـەڵام رامینگـر لـە(مۆسـکۆ) سەرسـام بـوو بەنەگەیشـتنی سندووقەکان-چونکــە بیرۆکراسیەتی یەکێك لەکارمەندەکان شەحنی سندوقەکانی گـــەڕاندەوە بـۆ ئـەڵمانیای ڕۆژئاوا بەهۆی کەم و کوڕی لەمامەڵەی پێویستی ڕەوانەکردنی سندوقەکان دا لـەگـەڵ ئەوەشـــدا ڕامــیرگر مەترســی بـــەر ژیـــانی خـــۆیدا و گەڕایـــەوە بـــۆ فڕگـــەی (دوسلدِروف)جارێکی تر سندووقەکانی ڕۆکیەتیە هەڵوەشاوەکەی ڕەوانەی (مۆســکۆ) کرد ...لەدوای سەرکەوتنی ئـەم پرۆسـەیەو چـەند پرۆسـەیەکی گچکـەی وەك ئەمـە دەست بەسەر تۆڕە بەکرێگیراوە ئەڵمانیەکەو بەرپرسە پۆلۆنیەکەیان (لیونسکی)دا گیرا ...کەچی بەخت یاوەری ڕامینگر بوو لەکاتێکدا لەساڵی ۱۹۷۱دا ڕۆژئاوا قایل بـــوو بەبەرەڵاکردنی لەبەرانبەربەکرێگیراوێکی ڕۆژئاوایی تردا...

شیاوی باسە ئەڵمانیا بەهەردوو باڵی ڕۆژئـــاوایی و ڕۆژهـــەڵاتی یـەوە ،ببویـە شـانۆی سیخوڕایەتی بەهۆی جێگـــەی جوگرافیەکـەی لەئـەورووپاداو بوونـی بـەرلینی ڕۆژئـاوا لەدڵی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتدا .(C.I.A) هەستا بەلێدانی تونێلێك لەبەرلینی ڕۆژئاواوە بۆ بەرلینی ڕۆژهەڵات بەمەستی گـــوێ هەڵخســتن لەهێڵــەکانی تەلــەفون لەئـەڵمانیای ڕۆژهەڵات دا ،لەکاتێکدا دەزگای (K.G.B) توانی چەندین بەکرێگیراوی دووســەرە

لەئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتدا بچێنێت،بەمەبەستی دەست خستنی تەکنەلۆژیای ڕۆژئـاوایی لەهەردووبواری سەربازی و مەدەنیدا...

لەلایەکی ترەوە (C.I.A) لەدوای جـەنگی جیـهانی دووەم هەسـتا بەدامـەزراندنی دەزگای موخابەراتی ئەڵمانیای ڕۆژئـاوا (ڕینـارد گیـلان)ی کـردە بەرپرسـی ... ئـەم گیلانە بەرپرسی موخابەراتی نازی بوو لەئەوروپای ڕۆژهـەڵات لەسـەردەمی هیتلـەردا بـەڵام دوای خۆدانـی بەدەسـت (C.I.A) و پێشـکەش کردنـی زانیـاری سـوودمەند سەبارەت بەدەزگا موخابەراتیەکانی ڕۆژهەڵات ..موخابەراتی ئـەمریکا هاتـە سـەر ئـەو بڕوایەی کەهاوکاری لەگەڵ کردنی باشترە لە زیندانـی کـردن یـاخود لەسـێدارەدانی ...بەو شێوەیە گیلان لەدوای جەنگ دەستی کردەوە بە تـەجنید کردنـەوەی بـەکرێ گیراوە دێرینەکانی لەووڵاتەکانی ژێر ڕکێفی ستالیندا .لەچەند پرۆسـەیەکی سـیخوڕی کردنیشـدا سـەرکەوتنی بەدەسـت هێنـا ،لـەگرنگترین سـەرکەوتنەکانی گەشـتنی بەکرێگیراوێکی ئەم بوو بەناوی (ارنست گرامش) بۆ پۆستێکی زۆر گرنگ و هەسـتیار لەموخابەراتی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتدا .. بەڵام لەتەمووزی ساڵی ١٩٥٠ز دا ،حکومەتی بۆن بڕیاری دا کاروبارەکانی موخابەراتی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بەڕێوەبەرێت و ناوەکەشـی بگۆڕێت و بیکاتە (ئاژانسی هەواڵـە فیدراڵیـەکان) پـاش قـایل بوونـی (C.I.A) بـەو گۆڕانکاریانـە .. هـەروەها ئامـاژەدەکرێت بـەوەی حکومـەتی بـۆن نـەیتوانی گیـلان لەپۆستەکەی لابدات وەك بەڕێوەبەری موخابەراتی ئەڵمانیای ڕۆژئـاوا ،دەسـت بـەجێ بەڕێوەبردنی کارەکانی ئەو ئاژانسەی گرتە دەست .

ساڵی ١٩٦٣ ڕیسواییەکی دیکە ی هێنایە لەرزە ،لەکـاتێکدا پـەردە لادرا لـەڕووی پەیوەندی سێ بەکرێگیراوی گیلان بە(K.G.B)ەوە ، سێ کەسەکە بریـتی بـوون لـە (هانز کلیمنس،ئەرفیل تابل ،هاینزفلیف)هەرسێکیشیان کۆنە ئـەندامی تـۆڕی (SS)ی نازی بوون لە سویسرا ... بەڵام هـاینز فیلـف ،وەك هـەندێك پێیـان وایـە ،مەترسـی دارترینیان بـووە و پـتر لەهەمویشـیان ئـازار بـەخش بـووە لـەڕووی چلۆنایـەتی ئـەو

زانیاریانەوە کە بۆ (K.G.B) دزیوون نەخاسمە خۆی بەرپرسی قەلاچۆکردنی سیخوڕی کردنی سۆڤیەت بوو لەنێو موخابەراتی ئەڵمانیای ڕۆژئاوادا ... ئەو زانیاریانەی لەدوایی دادگای کردنی ئەم سێ بەکرێگیراوەوە بڵاوبونەوە ،ئاماژەیان بەوە دەکرد ئەو سێ کەسە (١.٥ هەزار)وێنەی مەلە اتی موخابەراتی ئەڵمانی و ژمارەیەکی گەورەی کاسێتی تۆمارکردن و گوێ شنە ووتن یان داوە بە (K.G.B).. دوابەدوای ئەم ریسواییە سیخوڕیە ڕای گشتی ئەمریکاو ئەڵمانیای ڕۆژئاوایی قەڵسی خۆیانیان دەربڕی بەرامبەر بەسیاسەتەکانی (C.I.A) لەدووبارە تەجنید کردنەوەی گیلان ی نازی وەك بەرپرسی موخابەرات لەدوای جەنگ ،وەلێ ڕای گشتی ڕاستەوخۆ کارناکاتە سەر سیاسەتی سیخوڕی و دژە سیخوڕی.

هەر لەئەڵمانیای ڕۆژئاوادا ،موخابەراتی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا گۆلێکی گرنگی تۆمارکرد لەموخابەراتی بەرانبەردا ،کاتێك توانی یەکێك لە بەکرێگیراوەکانی بەناوی (گۆنتر گلیۆم) وەك پیاوێکی مەعلوماتی لەنوسینگەی ڕاوێژکاری ئەڵمانیای ڕۆژئاوادا (فیلی برانت) دابنێت ... (فیلی)ساڵی ١٩٧٤ دەستی لەکار کێشایەوە لەدوای ڕیسواییەکەی دەستگیرکردنی (گلیۆم) وەك بەکرێگیراوی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات .

لەئەوروپای دابەشبوو بەسەر ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا موخابەراتی چینیش ڕۆڵی سیخوڕی خۆی هەبوو لەشەستەکاندا ،ئەوەبوو لەو ساڵانەدا یەکەم ڕووداوی سیخوڕی لەشاری(هیگ)ی هۆڵەندی ١٩٦٦ رویدا ،لەکاتێکدا پیاوێکی چینی لەدەرەوەی حەرەمی باڵویزخانەی (چین)دا دۆزرایەوە و بەدەم ئازارەوە دەیناڵاند ،پاشتر دەرکەوت ئەو ئێش و ئازارە بەهۆی ئەشکەنجە دانیەوەبوولەسەر دەستی موخابەراتی چین دا ،باڵوێزخانەی چین لەوکاتەدا ڕای دەگەیاند گوایە ئەوکابرایەی کەناوی (هسو —تسو— تسای)ە لە پەنجەرەی باڵویزخانەکەوە کەوتۆتە خوارێ ... دوای ئەوەی هۆشی لەدەست داوە ئەمەش بۆتە هۆی شکانی کاسەی سەری و ئێسقانی دەستی ،(هسو تسای) دوای یەك ڕۆژ لەچارەسەری پزیشکی لە خەستەخانە ڕفێنرای ،و گوازرایەوە بۆ

باڵوێزخانەی چین ، ئەمیش بەڕۆڵی خۆی ڕایگەیاند (تسای) بەهۆی زامەکانیەوە گیانی لەدەست داوە ...

بەو هۆیەوە وەزیری دەرەوەی هۆڵەندا داوای لێکۆڵینەوەی لەمردنی تسای و شیکردنەوەی تەرمەکەی کرد بۆ زانینی هۆکاری مردنەکەی..کەچی باڵیۆز خانەی چین کێشەکەی بەناوخۆیی لە قەڵەم دا و ڕایگەیاندوەزارەتی دەرەوەی هۆڵەندە بەهیچ شێوەیەك بۆی نیە خۆی لەکێشەکە هەڵقورتێنێت،دوابەدوای ئەم ناکۆکیە وەزارەتی دەرەوەی هۆڵەندا باڵیۆزخانەی (چین)ی داخست ،پەکین لەبەرامبەردا هەمان هەڵوێستی گرتە بەرو باڵوێزخانەی هۆڵەندای لە (پەکین)داخست ،هەرچەندە داخستنی باڵوێزخانەکان درێژەی نەکێشاو زوو بەزوو ناکۆکیەکان چارەسەر کران .

ساڵی ١٩٦٩ ش ،ڕووداوێکی تر لە (هۆڵەندا) ڕووی دا ،تیایدا پەردە لادرا لەڕووی نهێنی باکگراوندەکانی ڕووداوەکەی یەکەم جار ،لە بیست وچواری ئەو ساڵەدا ،(لیو-هوشو) لەموخابەراتی چین جیابووەوەو داوای مافی پەنابەری ڕامیاری لە هۆڵەندا کرد .. (هوشۆ)بەرپرسی پرۆسەی ڕفاندنی (تسای)بوو لە ساڵی (١٩٦٦)دا .هوشۆ گووتی (موخابەراتی چینی بە ئۆتومبێلێك بەخێرایی داویانە لەتسای بەئامانجی کوشتنی دوای ئاشکرابوونی کرێگرتەیی ئەو پیاوە بۆ (C.I.A)بەڵام تسای دەست بەجێ نەمردووە ،ئەمەش موخابەراتی چینی ناچار کرد تاکو بیفرێنن و لەناوی بەرن) ئەو خۆی بەرپرسیاری ڕفاندنەکە بوو هەر سەبارەت بەو ڕوداوە سیخوڕیانەی لە شەستەکاندا لە ئەوروپادا ڕوویانداوە ، پێویستە ئاماژە بدەین بەو جیابوونەوەیەی (جۆزیف فرولیك)ی بەکرێ گیراوی موخابەراتی تیشکی لەساڵی ١٩٦٣ز دا پێی هەستا .

لەسەرەتادا،ژمارەیەك لەپسپۆڕانی سیخوڕی ڕۆژئاواهەل هەڵەیان بوو بۆ ئەم جیابوونەوەیەو وایان دەزانی فرولیك زانیاری بەکەڵکی لایەدەربارەی موخابەرای سۆڤیەت و هاوپەیمانەکانی،هێندەی نەبرد تاسان بەچۆنایەتی ئەو زانیاریانەی فرولیك

هێنابوونی بۆ ڕۆژئاوا. فرولیك پەردەی هەڵماڵی لەڕووی دزەکردنی سۆڤیەت بـۆ نێـو ڕیزەکانی پارتی کاری بەریتانی و ئەو سەندیکا کرێکاریانەی لەژێر کۆنترۆڵی ئەمدان .

هەروەها یەکێك لەبەرپرسەکانی ئەم حیزبەی بەناوی (ویل أون) تۆمەتبار کرد بەوەی بەکرێگیراوی موخابەراتی تشیکۆسلۆڤاکیا یە و بەرپرسێکی تریش بەناوی (جۆن سـتون هاوس) بەبەکرێگیراوی (K.G.B) دابوویە قەڵـەم ... لەگـەڵ ئەوەشـدا تۆمەتـەکانی فرولیك ڕاست درنەچوون ،(ویل أون)بەبێ تـاوان لـەو دادگایـە دەرچـوو کـە سـاڵی (١٩٧٠) لە (لـەندەن) بـۆی سـازدرابوو ،ئەمـە لـەکاتێکدا (هـاوس)خرایـە زینـدان بەتۆمەتی خۆدزینەوە لەیاسا دوای ئەوەی لەڕووی دادگــەری هـەڵات بـۆ ئوسـترالیاو ناوێکی دیکەی لەخۆی نابوو ،واته بەتۆمـەتی سـیخوڕی کـردن بۆسـۆڤیەت دادگـای نەکرا ... لەکاتێکی تردا ،فرولیك پەرتوکێکی بەناو نیشانی (پرۆسـەی جیابوونـەوەی فرۆلیك)بڵاوکردەوە ،تیایدا ئاماژەی داوە بە چەند کردەوەیەکی سیخوڕی بەبێ ئەوەی ئاماژە بە پاڵەوانەکانیان بدات ،ئەمەش هانی دا چـەند چاودێرێك بێـژن:(زانیاریـەکانی فرولیك،و کردەوە سیخوڕیەکانیشی بناغەی ڕاستیان نیە).

بەرلەوەی کۆتای بێنین بەرووداوەکانی ئەم بەشەی تایبەت بە ئەوروپا ، پێویستە بڵێین ،موخابەراتە جیهانیەکان لە ساڵانی شەستەکاندا زانیـاری بـێ وێنـەو زۆرو زەوەندیـان کۆکردەوە لەسەر کرداری سیخوڕی و دژە سیخوڕی لە ئەوروپادا،بۆیە لـەدوای ئـەو ماوەیە بڕیاری دا پسپۆڕایەتیە سیخوڕیەکانیان بگوازنەوە ناوچەیەکی دیکە لە جیـهان دا ... بۆ جیهانی سێهەم ... کت و مت بـۆ ئـەفریقا و ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت ..ئـەدی لەوێدا چ ڕووی دا ؟..

## بەشی شەشەم

## ﴿ ململانێی موخابەرات لەسەر گۆڕەپانی جیهانی سێیەم ﴾

ساڵی ١٩٦٠ (C.I.A) هاتە نێو گۆڕەپانی ململانێ لەجیهانی سێیەم دا لە دەروازەی کۆنگۆوە ە هەنوکە بە (زائیر)دەناسرێت، لەدووتوێی دەرکردنی بەلژیکیەکان لەو وڵاتە لەساڵی ١٩٦٠دا ، ڕێبەری نیشتمانی (باتریس لومومبا) توانی پۆستی سەرۆکایەتی حکومەت لە هەڵبژاردنێکی جەماوەریدا بپچڕێت ، کەلە کەش و هەوایەکی فەوزەویی وپڕلەترس و دڵەڕاوکێدا ئەنجام درا ،بەڵام شکستی هێنا لەسەقامگیر کردنی حوکمەکەی و سەپاندنی دەسەڵاتی بەسەرتاسەری خاکی کۆنگۆ دا ،لەدوای جیابوونەوەی هەرێمی (کاتنگا)بەڕابەرایەتی (موسی تشوجی)ئەمەش وایکرد (لومومبا ) و سەرۆك کۆمار لەوکاتەدا (جۆزیف کازافوبو)داوا لە نەتەوە یەکگرتووەکان بکەن دەست وەربداتە کاروبارەکانی کۆنگۆ و هەموو وڵاتەکە لەژێر یەك دەسەڵات دارێتی ڕامیاریدا کۆبکەنەوە ،نەتەوە یەکگرتووەکان لەلای خۆیەوە هێزی ئاشتی پارێزی ناوچەی سنووری ململانێکە بۆ پاراستنی هێمنایەتی و ڕژێم ، بەڵام ،وەك هەمیشە ئەرکەکانی لەجیاکردنەوەی هێزە ناکۆکەکان لەیەکدی تێپەڕی نەکرد ، ئەم حاڵەتە هانی (لومومبا)ی‌دا داوای هاوکاری سەربازی و ئابووری لەسۆڤیەت بکات لەپێناوی دووبارە کۆنترۆلکردنەوەی هەرێمی (کاتنگا).

ڕاستەوخۆ ،بەگەشتنی داواکاری هاوکاریەکە بە(کرملین)، (مۆسکۆ) لە (٨/٢٦ی ئ‌وساڵەدا ،(١٠٠)پسپۆری تەکنیکی و ١٠ فڕۆکەی گواستنەوەی جۆری (11-18)بەچەك و کەرەستەی سەربازیەوە ڕەوانەی کۆنگۆ کرد ...

له (واشنطن) كۆشكی سپی بەووردی و ئاگاییەوه چاودێری جم و جوولەكانی سۆڤیەتی دەكرد،نەخاسمە لەوولاتی كۆنگۆی دەولەمەند بەسامانە سروشتیەكان دا ،هەروەها (C.I.A) لەلای خۆیەوە دەستی كرد بەتوێژینەوەی مەلەفی (لومومبا)و كۆكردنەوەی زانیاری لەبارەیەوە ،وەك یەكێك لەڕێبەرانی جیهانی سێیەم كەدژن بەسیاسەتەكانی ئەمریكاو هاوپەیمانی سۆڤیەتن ،ئەوەی پتر گوومانی لەدەوری (لومومبا) هەلسان ،ئەو زانیاریانە بوو كە لە ڕاپۆرتێكی (لۆرنس دفلین) ناوی سیخوڕیەكەی فكتۆر (هدجن)ی بەڕێوەبەری (C.I.A) لەكۆنگۆدا هاتبوو ،تیایدا دەلێت :(كۆنگۆ بزافێكی هەلگەڕانەوە بەرەو كۆمۆنیزم بەخۆیەوە دەبینێت... تائێستاش هەل گونجاوە بۆ دوورخستنەوەی كوبایەكی تر لە ئەفریقادا)...

ئەم ڕاپۆرتە بەس بوو لای سەرانی (C.I.A) بۆ دەركردنی فەرمانی جفرەیی بۆ دفلین :(تۆ ئەركی دەستپێكردنی پرۆسەی هەلگەڕانەوەی ڕژێمت لەئەستۆ نراوە ... دوا مەكەوە)...

ڕۆژێك بەرلەوەی پسپۆرە سۆڤیەتیەكان بگەنە كۆنگۆ ، كۆبوونەوەیەك لە واشطن گرێدرا بەئامادەیی : ئالن دالس بەڕێوەبەری (C.I.A) ،گۆردن گرای یاریدەدەری سەرۆكایەتی بۆكاروبارەكانی ئاسایشی نەتەوەیی ،لیفینگستۆن مارشنت یاریدەدەری وەزیری دەرەوە بۆكاروباری ڕامیاری ، جۆن أیروین دووەم یاریدەدەری وەزیری بەرگری ،بەرپرسێكی دیكەی (C.I.A) بەناوی تۆماس باروت، كۆبوونەوەكە تەرخان كرا بۆ تاوتوێ كردنی بارودۆخی كۆنگۆ وڕێگەكانی ڕووبەڕو بوونەوەی .

لەوكاتەدا ئەندامە كۆوەبوەكان ڕێككەوتن لەسەر ئەوەی : (ئەو ئامادەباشیانەی (C.I.A) لەكۆنگۆ پێی هەلدەستێت هیچ پلانێك هەلناوێرێت بۆ قووتاربوون لە (لومومبا)و ڕژێمەكەی ).. لەئاكامی ئەم ڕێكەوتنەدا ،(ئالن دالس) پەیامێكی جفرەیی نارد بۆ (دفلین) لەپایتەختی كۆنگۆ ،لیوبۆلدفیل ، تیایدا دەلێت :(تۆ دەستەلاتی فراوانترت خراوەتە بەر دەست بەجێبەجێكردنی كردەوەی هێرش بەرانەشەوە لەكاتی

پێویستیدا ،بەمەرجێك کردەوەکان بەنهێنی بمێننەوە)، هەروەها (دالس)لەهاوپێچی ئەم پەیامەدا (١٠٠هەزار دۆلار)ی ئەمریکی ڕەوانە کرد بۆجێبەجێکردنی کردەوەکەی (کۆنگۆی ئەفریقی)..

هەردوابەدوای بەدەست گەیشتنی پەیامی بەرپرسیارێتی دفلین دەستی کردە چالاکیەکانی لەنێو کەسایەتی و گروپە ڕامیاریە نەیارەکانی لومومبا دا ، نەخاسمە کەزۆرێك لەو کەسایەتیانە پلانی تیرۆر کردنی لومومبا یان خستبویە بەردەستی سەرۆك کۆماری کۆنگۆ (کازافوبو)بۆدەربازبوون لە قەیرانەکە ... بەلام (کازافۆ) پرۆژەی پلانەکەی ڕەتکردەوە ،پێی باشتر بوو لومومبا پۆستەکەی دەربکات ئەوەبولە (١٩٦٠/٩/٥)دا لومومبای لەسەر کار لادا ،دوای ئەوەی ژەنرالێکی سەربازی بەناوی (مۆبۆتۆ)و بۆکۆتا جار دەرباز بوون لە (لومومبا)و نفوزی سۆڤیەت کەلەو وولاتەدا (لومومبا)بەرجەستەی دەکات ،بەتایبەت لەکاتێکدا نەتەوە یەکگرتووەکان هەولی دەدا بۆ دووبارە گەڕاندنەوەی ژیانی پەرلەمانی بۆ کۆنگۆو دەستەلات دانە پەرلەمان بۆ بڕینەوەی مەسەلەکە ئەمەش یانی دووبارە هەلبژاردنەوەکی لومومبا کەجەماوەرێکی بەرینی هەیە ،هەروەها (C.I.A) دەترسا لەئەگەری هەستانی سۆڤیەت بەکردەوەیەك کەببێتە هۆی گەڕانەوی لومومبا بۆسەر کورسی دەستەلات و دارنینی ڕکابەرەکەی (موبوتو) لەسەرکردایەتی سوپا.

بەگوێرەی ئەم ترس و دلەڕاوکێ یانە ،(C.I.A) بڕیاری دا لومومبا بەچەکە خەیالیەکەی تیرۆر بکات واتە بەژەهری کوشندە ، لەبەر ئەوە (C.I.A)داوای لە کیمیازان (سیدنی گوتلیب)ڕاوێژکاری زانستی بەڕێوەبەری پلاندانان (ریشارد بیسل) کرد ،ماددەیەکی ژەهراوی ئامادەبکات کە یێك هاتبێت لە ڤایرۆزێکی ئەفریقی کوشندە بۆ ناردنی بۆ کۆنگۆ تاکو کردەوەکەی پێ جێبەجێ بکرێت ،لەدوایدا (گوتلیب)خودی خۆی چوە پایتەختی کۆنگۆو ماددە کوشندەکەشی لەتەك خۆیدا هەلگرتبوو تاکو لەوێ (دفلین)بەڕێوەبەری (C.I.A) لەکۆنگۆ لەسەر بەکارهێنانی

( گاڵتە کردن بە ئاسایشی دەوڵەت لە شەستەکاندا بوو بە هۆی سەرهەڵدانی پشێوی و قەسابخانە لە کۆنگۆدا ،
لەم وێنەیەدا دە شۆڕشگێڕ دەبینرێن تاوانبار کراون بە کوشتنی دووژن لە گوندێکدا ، ئەوەتا لەم وێنەیەدا
ئەشکەنجە دەدرێن تاکو دەمرن و گیان لە دەست دەدەن ) .

ڕابهێنێت ،یاخود یەکێك لەبەکرێگیراوەکانی دفلین ڕابهێنێت بۆ بەکار هێنانی لەتیرۆرکردنی لومومبادا ، وەلێ ئەم جارە (C.I.A)وەك ڕێو شوێنێکی یەدەگ لەئەگەری هەرەسهێنانی پلانی ژەهر خواردنەکەدا دووپیاوی کۆماندۆسی ئەمریکی بەناوی (رووج)و (وین)بۆ جێبەجێ کردنی پلانەکە نارده کۆنگۆ .

ئەو دەمەی (دفلین و گوتلیب)مشت و مڕیان دەکرد لەسەر چۆنێتی گەیاندنی ژەهرەکە بە گەدەی لومومبا ،بڕوایەکیان بۆ درووست بوو کە سەرۆك (ئایزنهاوەر) خوودی خۆی گلابێت لەم پرۆسەی تیرۆرکردنەوە ، ئەرکەکەش تابعێکی نیشتمانی ڕامیاری هەیە پتر لەم بڕوایە دڵنیابوون ، بەڵام ئەو دوو پیاوە شکستیان هێنا لەگەیاندنی ژەهرەکە بە لومومبا ،بەر لەوەی ژەهرەکە کارایی خۆی لەدەست بدات لە کوشتنی ئەو کەسەدا کەبیخوات .بەتایبەت گوتلیب لەو کاتەدا نەی توانی ئەم ژەهرە بپارێزێت لە نێو پلەیەکی زۆر بەرزی گەرمادا لە زائیر ،بۆیە لە ١٠/٥ دا گەڕایەوە بۆ (واشنطن)،بۆ ئەوەی جارێکی تر دووپاتی بکاتەوە ،کە پلانەکانی (C.I.A) لەمەڕ

بەکارهێنانی ژەهر ،پلانێکی خەیاڵین و ئەم بەکارهێنانە تەنها لەبەر نامەکانی تەلەفزیۆن دا نەبێت ئیدی درووست نین ،لە گەڵ ئەوەشدا (دفلین) هیوا بڕاو نەبوو ،پلانەکەی گۆڕی و بڕیاری دا بەهۆی پیاوانی کۆماندۆسەوە لومومبا تیرۆر بکات،بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم ئەرکەش (جوستین ئەو دوناڵ)ی دەستنیشان کرد،ئەم بەگومانەوە هاتبوو بۆ زائیر گوایە ئەرکی بریتی دەبێت لە دەرکردنی لومومبا لە جێگەی خانە زۆرە ملێکەیدا ،بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە (ئەودوناڵ)داوای گەورە پیاوی کۆماندۆس وینی کرد بۆ یارمەتی دانی لەدەرکردنی لومومبا دا .. کەچی لومومبا ماڵەکەی خۆی بەجێهێشتبوو ،ڕووی کردبووە ناوچەی (ستانلی فیل) کەنفوزێکی زۆری تیایدا هەبوو لە هەوڵێکیدا بۆ دووبارە دەسەڵات گرتنەوە دەستی لە وڵاتدا ،لەپاشدا (C.I.A) بەهاوکاری سەربازەکانی مۆبۆتۆ هەموو ڕێگەکانی (ستانلی فیل)یان بڕی ە توانیان لومومبا دەستگیر بکەن کەبڕیار بوو ماوەی زیندانیتی لەناوچەی (بکوانا)دا بەسەر بەرێت کەئەو دەم بەناوچەی (سلخ)ناسرابوو ،ڕۆژی ١/١٧ ئەو فرۆکەی لومومبای دەگواستەوە لەبری (بکوانە) ڕووی کردە کاتانگا و لەوێش دا هەواڵی کوژرانی لومومبا بلاوکرایەوە بێ ئەوەی هۆکارەکانی ڕوون بکرێنەوە ، ناسنامەی بکوژەکانیش کە کردەوەکەیان جێبەجێکرد تائێستا نەزانراوە.. هەرچەندە زۆرینەی بەڵگەکان ئاماژە دەکەن بۆ سەرۆك (ئایزنهاوەر) وەك خاوەن تفویض لە مەسەلەکەدا .. بۆ (C.I.A)یش وەك هاوەڵی پلان ڕێژو دژەکانی لومومبا لە کۆنگۆ وەك جێبەجێکارانی پلانی تیرۆر کردنەکە.

بەو جۆرە (C.I.A) قوتار بوو لەڕابەرێکی جەماوەری وەك (لومومبا)لە جێگەکەشیدا دیکتاتۆرێکی سەربازی پێشێل کەری مافەکانی مرۆڤ وەك ژەنەراڵ (مۆبۆتۆ)ی دانا ..مۆبۆتۆ پاش کەمێك لە جڵەوگرتنە دەستی بویە یەکێك لەهەرە دەوڵەمەندەکانی دونیاو سامانەکانی بە (٣ملیار دۆلاری ئەمریکی) مەزەندەکرا. لەلایەکی ترەوە (C.I.A) پەیوەندیەکانی خۆی توندو تۆڵ کرد لەگەڵ دەزگای

موخابەراتی باشوری ئەفریقای ڕەگەز پەرست هەرلەسەرەتای دروست بوونی دەزگاکەوە لەسالّی (١٩٦٩)دا یان لەباراره بلّێین (C.I.A) دەزگای موخابەراتی باشووری ئەفریقیای ڕاهێناو مەشقی پێکرد و دایمەزراندو ئامادەباشی پێبەخشی بۆ ئەوەی یارمەتی بدات و هاوکاری بکات بەکۆکردنەوەی زانیاری لەسەر شۆرشە ڕزگاری خوازەکان لەبەشی باشووری ئەفریقیادا ،وەلەسالّی (١٩٧٧)دا جێگری پێشووی بەڕێوەبەری موخابەراتی ئەفریقیای باشوور دووپاتی ئەم ڕاستیانەی کردەوە کە گووتی (کادرەکانمان لەسەر دەستی موخابەراتی ئەمریکادا مەشق دەکەن ،ئێمە کات ناکاتێك دانیشتن و کۆبوونەوە لەگەلّ گەورە کاربەدەستانی (C.I.A)و موخابەراتی

(مۆمبیا (لە ڕاستەوە) بە گوریس بەستراوەتەوە و بە شەقامەکاندا دەیگێڕن و ئامادەی دەکەن بۆ تیرۆر کردنی (وێنە بچوکەکەی ژێرەوە) ... سودمەندی هەرە گەورە لە کوژرانی لومۆمبا ، دیکتاتۆر مۆبۆتۆ لە یەکێك لە کۆنگرە ڕۆژنامە نوسیەیە ئامۆکانیدا ، مۆبۆتۆ سەرەڕای ئاوانە یەك لە دوای یەکەکانی کەچی پشتگیری بێ سنووری دەکرا لە لایەن ( C.I.A ) هوە ...) .

ئەڵمانیای ڕۆژئاوادا گرێدەدەین بەمەبەستی گۆڕینەوەی زانیاری سیخوڕی و دارۆشتنی پلانی ئیستراتیژی لونیوانهەرسێ دەزگا موخابەراتیەکەدا) هەروەها ڕۆنامەڤانی ناسراوی بەریتانیاش (ئەنتۆنی سامپسۆن)یش دووپاتی ئەم پەیوەندیە بەتینەی کردەوە بەوەی دەڵێت (تۆڕی (C.I.A) لە بریتۆریا – باشووری ئەفریقیا – پشت بە ڕاپۆرتی موخابەراتی باشووری ئەفریقیا دەبەستێت دەربارەی بزوتنەوە ڕزگاری خوازە ئەفریقیەکان و چالاکیەکانیان)شیاوی ئاماژە پێکردنە موخابەراتی باشووری ئەفریقیا کەناسراوە بە (بوس)بۆپاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی و بەرژەوەندیە دەرەکیەکانی وولات هاتۆتە دامەزراندن لێرەوەش بەرپرسیارێتی چاودێری کردنی دەزگاکانی پۆلیس و هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆی بەسەردا درا لە دوای ڕاستەوخۆ بەستنەوەیەوە بەسەرۆکایەتی حکومەتەوە بەڕێوەبردنی ئەم دەزگایەش درایە دەست ژەنەراڵ (هندریك ڤاندنبرگ)دۆستی ناسراوی تێزی مارکسیەت و دوژمنی قین لە دڵی گەلانی ڕەش پێست ... هەروەها ڤاندنبرگ خۆیکردە بەڕێوەبەری دەزگای پۆلیسی ناوخۆ لەساڵی (١٩٦٣)دا لەدوای گەشەسەندنی بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی کەتا ئێستاش کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی لەباشووری ئەفریقیا سەرۆکایەتی دەکات هەروەها پێویستە ئاماژەش بدەین بەوەی دەستنیشانکردنی ڤاندنبرگ بۆ ئەو پۆستە بالایە هەروا هەڕەمەکی نەبوو بەڵکو بەپێی پلانێکی تۆکمەی دارێژراو بوو لەلایەن سەرۆکی حکوومەت لەو کاتەدا (جۆنفۆستر) (هاوەڵی ڤاندنبرگ لەبزوتنەوەی نازی ماوەی جەنگ و هاوڕێی زیندانیشی دا لە هەمان ماوەدا ) جگە لەوەش ئاتاجمان هەیە بەئەنگوست ڕاکێشان بۆدژایەتی زۆر ی ڤاندنبرگ بۆ ڕەشپێستەکان لەباشووری ئەفریقادا کە گەشتە ڕادەیەك ژمارەی ئەو زیندانیە سیاسیانەی بەهۆی ئامێرەکانی ئەشکەنجەدانەوە گیانیان لە دەست دا بە(٤٨)پیاومەزەندەکرا ئەمەش وایکرد لەحکومەتی باشووری ئەفریقا تالە ساڵی (١٩٧٨ز)دا ڤاندنبرگ لە پۆستەکەی لابدات و بەرپرسێکی میانە ڕەو دەستنیشان بکات بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ئاسایشی

دەوڵەت ...سەرەڕای ئەو خەسڵەتە ڕەگەز پەرستانەی حکومەتی باشووری ئەفریقیاو موخابەراتەکەی (بوس)هەیان بوو کەچی وولاتە یەکگرتووەکان و (C.I.A) بەتایبەت پەیوەندیەکانیان لەگەڵ ئەم دەوڵەتەدا توندوتۆڵ کردلەبەر چەندین هۆکاری ئیستراتیژی وەك بۆ نمونە ئەگەری چاودێری کردنی جموجوڵەکانی سۆڤیەت و کوبا لە مۆزەمبیق و ئەنگۆلادا...

هەروەها بەکار هێنانی بەندەرەکانی دەوروبەری (رأس الرجاء الصالح) بۆ چاودێری کردنی جموجوڵە دەریاوانیەکانی سۆڤیەت و ژێر دەریاییە ناوکیەکانی (مۆسکۆ) ... لەقۆناغێکی پەیوەندی گەشە سەندووی نێوان وولاتە یەکگرتووەکان وباشووری ئەفریقیادا (C.I.A) ڕاپۆرتی مانگانەی نهێنی لە (بوس)ەوە پێدەگەیشت دەربارەی جموجوڵەکانی سۆڤیەت و کوبا لە مۆزەمبیق و ئەنگۆلادا لەلایەکی ترەوە(C.I.A)هەستا بەناردنی هەندێك لەپیاوەکانی بۆ سەنتەرەکانی پەیوەندی سیخوڕی سەربە (بوس)لەناوچەی (المنجم الفضی) نزیك (کاپتاون)..لەوێندەرێوە پیاوانی (C.I.A) دەستیان کرد بەناردنی ڕاپۆرتی نهێنی بۆ سەنتەری ئاژانسی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکی لە(فۆرتمیت)لە وولاتە یەکگرتووەکان لەرێی سەنتەری پەیوەندیە حکومیە بەریتانیەکان .لەکاتێکدا باسکی (بوس)ئەستوربوو حکومەتی باشووری ئەفریقیا بەرابەرایەتی سەرۆکی حکومەت (فۆرستر)و هاوڕێ ڕەگەز پەرستەکەی (ڤاندنبرگ) بە جدی بیریان دەکردەوە لە بڵاو کردنەوەی پروپاگەندەی تایبەتی خۆی لە جیهاندا وەك ئەو کردەوەی ڕاگەیاندنی ئەمریکاو سۆڤیەت دەیکەن ساڵی (١٩٧٢ز)(کۆنی مۆلدر)ی وەزیری ڕاگەیاندنیان ڕاسپاردبەهەستان بەم ئەرکە پروپاگەندەییە بۆ کەسبکردنی ڕای گشتی ئەورووپی و ئەمریکی و گۆڕینی بەرەوتی دژایەتی کردنی ڕەش پێستەکان لەبریتی هاوسۆزبوون لە تەکیاندا... هەروەها حکوومەتی باشووری ئەفریقیا بڕی (٧٣ ملیۆن)دۆلاری ئەمریکی تەرخانکرد بۆ یەکێك لە کادرەکانی بەناوی (د.إسکال رودی)بۆ جێبەجێکردنی پلانی کردەوە پروپاگەندەییەکەو دامەزراندنی

دەزگـاو دامـەزراوەی گونجـاو بـۆ پرۆژەکـە بـەو شـێوەیە (بـوس) یەکـەم ڕۆژنامـەی پروپاگەندەیی لەباشووری ئەفریقیا دا بلاوکردەوە بەمەبەستی قەلاچۆکردنی کارەکـانی (کۆنگـرەی نیشـتمانی ئـەفریقی)و نـاوی ڕژنامەکەشـی نـا (هـاولاتی) هـەروەها (١٠ملیـۆن)دۆلاری تـەرخان کـرد بۆکڕینـی ڕۆژنامـەی (ئەسـتێرەی واشنطن)((واشنطن)ستار) لەڕێگـەی بـلاو کـاری ناسـراولە (میتشـیگن)(جـۆن مـاك گۆف)ەوە بەلام سـەندیکای ڕۆژنامەکـە بەلێندەرایـەتی فرۆشـتنەکەیان ڕەفـز کـردوو ڕێگەیان بە فرۆشتنی ڕۆژنامەکە نەدا لە بەریتانیاش (بوس)توانی دزە بکاتە نێو ڕیزەکانی دوو دامەزراوەی خـێرخوازەو، یەکـەمیان نـاوی (هاریکـاری مەسـیحی)هـەلگرتووەو کاردەکات بۆ قەلاچۆکردن و بنەبڕکردنی برسێتی لە جیهاندا دووەمیشیان دامەزراوەی (کنون کلیـنز)ی پـەروەردەیی بـوو ئـەمیش دامەزراوەیـەکی خـێرخوازەو تایبەتـە بـە چاودێری کـردن و فـێرکردنی ڕەش پێسـتەکان لەبەشـی باشـووری ئـەفریقیادا بـەلام حکومەتی بەریتانیا ئاگاداری دا بەهەردوو دەزگاکە دەربارەی ناسنامەی دزەکارەکان و ئەو لایەنەش کەلە پشتی دزەکردنەکەوە دەوەستێت لە (نـەرویژیش)(بـوس) حـیزبێکی ڕاسـت ڕەوی هاوسـۆزی باشـووری ئـەفۆیقیای تـەمویل کردئەمـە لـەکاتێکدا هـەمان موخابەرات کاری دەکرد بۆ دەستگیرۆیی کردنی هەلمەتی هەلبژاردنی (جیرالد فۆرد) بۆسەرۆکایەتی وولاتە یەکگرتووەکان هەلمەتەکانی هەلبژاردنی هەریەك لـە (صموئیـل هیکوا)بۆ ئەندامێتی کۆنگریسی ئـەمریکی لەسـالی (١٩٧٦ز)(روجـر جیبسـون)دژی سیناتۆر دیك کلارك لەسالی (١٩٧٨)دا هەرلەلایەن (بوس)ەوە تەمویل کـران .. وەلێ ئەم هەلمەتە پروپاگەندەییانە کە حکومەتی (فورسـتر)لە میانەی دەزگای (بوس)ەوە پێـی هەلدەستا هێدی هێـدی شکسـتیان هێنـاو لێـك هەلوەشـان لـەدوای (ڕیسـواییەکەی مۆلدر)(واتە کۆنی مولدری وەزیـری ڕاگـەیاندن)کەتۆمـەت بـارکرا بـە سـودگەڕایی تایبـەت لەمیانـەی ئـەو کـردەوە پروپاگەندەییانـەی بـۆ حیسـابی تایبـەتی خـۆی پێـی هەستابوو..دوابـەدوای ئـەم ڕیسـواییە (فورسـتر)لـە پۆستەکەی دەسـتی کێشـایەوە

لەجێگـەیدا (ب.دبلیـو.بۆتـا)هـەڵبژێررا ئـەم هەوڵـەکانی چڕکـردەوە لـە چۆنیــەتی قوتارکردنی باشووری ئەفریقیا لەو دابڕانـە ڕامیاریـەی لــە ئـەوروپادا هەیـەتی وەقـایل کردنی دەوڵـەتە ڕۆژئاواییەکان بۆدوبارە پر چەککردنەوەی سوپاکەیی و یارمـەتی دانـی لـەڕووی (لـوجستی)و کوشـتەوەریەوە ...بـەڵام هەڵوێـستە ڕەگــەز پەرسـتانەکەی (بۆتا)لەدژی هاوڵاتیە ڕەش پێستەکان لە وڵاتەکـەیدا لــە ڕوی جەوهـەرەوە جیـاوازی نـەبوو لــە گـەڵ هەڵوێـستەکانی فورسـتر دا جگـە لـەوەی ئـەم لەسیاسـەتە ڕەگــەز پەرستانەکەیدا پشتی بە موخابەراتی سەربازی دەبەست لەبری دەزگای (بوس) کـەناوی لێنا (دەزگـای موخابـەراتی نیشـتمانی)لەسـاڵی (١٩٧٨) هـەروا لـەڕووی چـالاکی سـیخوڕی ئەفریقیـەوە (ڕیشـارد بیسـل) جێگـری بەڕێوەبەرایـەتی پــلان دانــان لــە (C.I.A)دا ژیانی سیخوڕی لەو بەشەی جیهاندا بەم چەند دێـرە کـورت دەکاتـەوە : (جیــهانی ســێهەم باشــترین گۆڕەپانــە بـــۆ جێبــەجێکردنی کـــردەوە نهێنیــە سـیخوڕیەکان،هەمیشـە دەوڵـەتـە دواکـەوتووەکان دەسـەڵاتداریێتی لاواز و دەزگــای ئاسایشی ساکار جڵەو گیرن تیایدا،حیزب و ڕێکخراوە ناوخۆییەکان ناوچـەی نفـوزی جۆراو جۆر لە وولاتدا داگیر دەکەن)،لەنێو ئەو دەوڵەتانەدا کە (بیسل) باسـیان لێـوە دەکات ،ئەگەر نەڵێین تاکە نمونەی ئـەو وولاتانـە ئەنگۆلایـە ،کەسـەر بـەخۆیی خـۆی لەنێوکەش و هەوایەکی ڕامیاری و سەربازی پڕ گرێ و گوڵدا بەدەسـت هێنـا ،پاشـتر بوویە گۆڕەپانی ئەزموونی سیخوڕی لەنێوان ((K.G.B) و C.I.A)دا ئەمـەش پـتر پتر یەکپارچەیی ئەنگۆلای لێکترازاند و ئـەو وولاتـەی کـردە پاشـکەوتو تریـن وڵاتـی جیهان.لە دەمێکدا دەوڵەتەکانی ژێر کۆلۆنیالیزم بەشێوەی هێدی هێدی سـەربەخۆییان وەردەگرێت ،ئـەنگۆلا بـاجی خوێنـی دەدا بـۆ وەرگرتنـی سـەربەخۆیی لــە دەوڵــەتی پورتوگال کەلەشەسـتەکاندا پیـاوە ڕەقەکـە (انطونیـودی اولیفـیرا سالازار)ڕابەرایـەتی دەکرد... ساڵی ١٩٦١ سالازار بۆچوونی خۆی دەربارەی بزوتنەوەی ڕزگـاریخوازی ئەفریقی لە ئـەنگۆلا بـۆ یـەکێك لەدبلۆماسیەکانی ئـەمریکا بـەم دەسـتەواژەیە ڕوون

دەکاتـەوە : ((تاکـە نەتەوایـەتی لەئـەنگۆلاو مۆزەمبیـق بریتیـە لـە قەومیـــەتی گـــەلی پورتوگال)). هەروەك ســالازار توانــی بــووی لــەو فەرمانـە ســەربازیانەی بـۆ ســوپای پورتوگالی دەردەکرد تەرجەمەی ئەم بۆ چونەی بکات لە تێکشـکاندن و لـەنێو بردنـی نیشتمان پـەروەرانی ئـەنگۆلادا ... بـۆ وەڵام دانـەوەی ئـەم هەڵوێسـتە ڕەق و چـەق بەسـتوانەی سـالازار ،وولاتـە یـەکگرتوەکانی ئـەمریکا لەنەتـەوە یـەکگرتووەکان دا ڕەخنەی توندو تیژی لەو ڕابەرە پورتوگالیە گرت ،و داوای لێکرد کارئاسـانی بکـات بۆ پاشە کشێی سوپای پورتوگـال لـە ئـەنگۆلا بەشـێوەیەکی ئاشـتیانە هـەروەها ولاتـە یـەکگرتوەکان دەسـتی کـرد بـەناردنی یارمـەتی پزیشـکی و دارایـی بـۆ حکومـــەتی شۆڕشگێڕی ئەنگۆلا لە مەنفا بەڕابەرایەتی (هۆڵدن روبرتو).

بەلام زۆری نەبرد سیاسـەتەکانی (واشـنطن)گۆڕانیـان بەسـەردا هـات دوای ئـەوەی (C.I.A) هەسـتی کـرد بـەوەی کەپێویسـتە پشـت ببەسـتێت بـەبونی پورتوگـــال و جێبەجێکردنی کـــردەوەی ســەربازی ئیســتراتیژی لەناوچـەی (ئـازورس)لەنێوەڕاسـتی زەریای ئەتڵەسی دا..

بۆ پێکهاتنــەوە لەگـەڵ بەرژەوەندیـەکانیدا (واشـنطن)هاریکاریـەکانی بـۆ حکومـەتی شۆڕشگێڕی ئەنگۆلا وەستان و دەستی کردە پرچەك کردنی سـوپای پورتوگـال و لـەم میانەیەدا فڕۆکەی جەنگی پێویسـتی دابـین کـررد بـۆ سـەرکوت کردنـی بزوتنـەوەی نیشـتمان پـەروەرانی ڕەش پێسـت لـە ئـەنگۆلادا ،لـەم کاتـەدا چـەند ڕێکخراوێکـی شۆڕشگێڕی تر دەستیان بەچالاکی کردبوو لەنێو هۆزەکـانی گـەلی ئـەنگۆلاداو هـانی خەڵکیان دەدا بۆسەر بەخۆیی تەواو لە پورتوگال .

لـەنێو ئـەو ڕێکخراوانـەدا (یـەکێتی نیشـتمانی بـــۆ ســـەربەخۆیی تـــەواو)دەبیـــنرا بەسـەرۆکایەتی (جۆنـاس سـایڤیمبی)کەلەسـاڵی ١٩٦٦دا لـەبزوتنەوەکـەی سـەرۆکی حکومەتەکەی مەنفا (ڕۆبرتو)جیابوویەوە ...

شایەنی باسە ڕابەرایەتی (ڕۆبرتۆ) هێدی هێدی لە پاشەکشەی دەدا ،لەدوای ڕاوەستاندنی هاوکاری ئەمریکیەکان بۆی ،سەرەڕای گرنگی ئەوڕۆڵەی دیکتاتۆری کۆنگۆ(زائیر)ژەنەراڵ (مۆبۆتۆ)ڕۆبرتۆو یەکێك لە گرنگترین هاوپەیمانەکانی دەی گێڕا سەرەڕای دان نانی ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقا لەساڵی ١٩٦٤دا بەشەرعیەتی حکومەتەکەی (ڕۆبرتۆ)دا.

ئەمەو درەوشانەوەی ئەستێرەی (بزوتنەوەی شەعبی بۆ ڕزگارکردنی ئەنگۆلا)کەلەساڵانی ١٩٥٦دا دامەزراو کۆبوونەوەی کۆمەڵێکی بەر فراوان لەنێشتمان پەروەرە ڕەش پێستەکانی دانیشتووی لوانداو بەشی ڕۆژهەڵات ،لەدەوری ئەم بزوتنەوەیە ترازاوەکانی هێزی لە ئەنگۆلادا گۆڕی و ئیستراتیژیەتی ڕێکخراوەکانی تریشی بەهەمان شێوە گۆڕی نەخاسمە ڕێکخراوی (یەکێتی نیشتمانی)... جگە لەوەش ئەمانە کاریان نەکردە سەر هێزو بێزی (بزوتنەوەی شەعبی بۆ ڕزگارکردنی ئەنگۆلا)کەتوانی بووی دانپێدا نانی (زامبیاو یەکێتی سۆڤیەت)بۆخۆی مسۆگەر بکات.. و ڕۆڵی حکومەتەکەی مەنفای بەڕابەرایەتی (ڕۆبرتۆ) لە قالب دا، بەتایبەت کە لەساڵی ١٩٧١دا (ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقا)دان پێدانانی خۆی بەحکومەتەکەی (ڕۆبرتۆ)دا کێشایەوە..

ئەمەو (ڕۆبرتۆ) کۆڵی نەداو ڕێکخراوێکی نوێی دروستکرد و ناوی لێنا(بەرەی ڕزگارکردنی ئەنگۆلا)و لەنێوپایتەختی کۆنگۆ (لیوبوفیل)(واتە کینساشای ئێستا)وە دەستی کردەوە بەچالاکی .

لەگەڵ بەردەوامی پشێوی لە ئەنگۆلادا ،کۆمەڵێك ئەفسەری چەپ ڕەو لەپورتوگال توانیان ڕژێم بڕوخێنن و دەست بەسەر حوکم دا بگرن لەدوای لەکار خستنی جێگرەکەی سالازار (مارشیلۆ کاپاتانۆ).. لەیەکەم پەخش نامەیدا ،ئەفسەرە ڕزگاری خوازەکان ڕایان گەیاند :پاشەکشەکردن لەئەنگۆلا یەکێکە لە سەرەکیترین ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوەیان،ئیدی پاشەکشە لەئەنگۆلا زۆر نزیك بوو ... لەنێو کورەی ئەم

ئالوگۆڕە خێرایانەدا ،(C.I.A) دەستی کردە ئامادەباشی وەرگرتن و خۆسازدان بۆ چەند کردەوەیەکی نهێنیلەئەنگۆلادا بەئامانجی سنووردانانێك بۆ بڵاوبوونەوەو گەشەکردنی (بزووتنەوەی شەعبی)هاوسۆزی سۆڤیەت و گەشتنی بە حوکم لەدوای گەڕانەوەی سوپای پورتوگال ... لەبەر ئەوە سەرۆك (جیرالد فورد)سەرانی (C.I.A)ی ڕاسپارد و سەربەستی کرد لەبەکارهێنانی (۳۲ملیۆن)دۆلاردا بۆ جێبەجێکردنی ئەم کردەوە نهێنیانە ...ئەمەو وەزیری دەرەوە (هنری کیسنجر)بەتوندی پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کەپێویستە کردەوەکان بەنهێنی بمێننەوە لەبەر دووهۆکار یەك لەو هۆکارانە ناوخۆیی بوون و پەیوەندی هەبوو بەڕادەی گرژی و ناسکی پەیوەندیەکانی نێوان ((مۆسکۆ) وواشنطن)ەوە... سەبارەت بەو ملیۆنەها دۆلارەی (C.I.A) لە ئەنگۆلا دابەشی کرد نیوەی چووە گیرفانی (مۆبۆتۆ)ی دیکتاتۆری کۆنگۆ وە کەڕۆلێی ناوەند گیری دەبینی لەنێوان (C.I.A) ی هاوپەیمانی هەمیشەیی و (ڕۆبرتۆ)ی میوانیدا... ڕێکخراوی یەکێتی نیشتمانی لە باشووری ئەنگۆلا بەسەرۆکایەتی (ساڤیمبی)وەککارتی گوشار لە دەستی موخابەراتی باشووری ئەفریقادا مایەوە،بەهۆی نزیکی سنوورەکانیەوە لەو ناوچەوە کەسوپای باشووری ئەفریقا و نامیبیا پێک دەگەن.

سەبارەت بە بزوتنەوەی شەعبی لەدوای پاشەکشەی پرتوگالیەکان ،وادەر کەوت بەهێزترین گروپ و جەماوەردارترینیان بێت ،ئەمەش وایکرد لە (C.I.A) و مۆبۆتۆی بەکرێگیراویان کە ئەنگۆلا لەباکورەوە داگیر بکەن بەهۆی چەند دەستەیەکی سەر بەمۆبۆتۆ وە لەسەربازەکانی سوپای تایبەتی مۆبۆتۆهەروەها هێزەکانی ڕێکخراوی یەکێتی نیشتمانی بەهاوکاری سوپای باشووری ئەفریقا بەشی باشووری وڵاتیان داگیر کرد لە هەوڵێکدا بۆ دابەشکردنی پەنیرەکە بەر لە قووت درانی.. لەبەرانبەر ئەم ڕەوشە سەربازیەی دژی (بزوتنەوەی شەعبی)بەرپاکرا لەپایتەخت و ناوچەکانی ناوەڕاستی وڵاتدا هیچ ڕێگە چارەیەك لەبەردەم سەرانی بزوتنەوەکەدا نەما جگە

لەهەڵبژاردنی ڕێگە چارەی دەست تێوەردانی ڕاستەو خۆی (کوبی-سۆڤیەتی) بۆ ڕزگارکردنی ئەو برە نفوزە مارکسی و شیوعیەی لەوڵاتدا ماوەتەوە .

( بەکری گیراوێکی موخابەراتی ئیسرائیل ، لە ئەردەن فەرمانی خنکاندنی بەسەردا دراوە ) .

لەئاکامی ئەم دەست تێوەردانەی کوبادا ،خەرجیەکانی (C.I.A) بەشێوەیەکی نائاسایی زیادی کرد،ئەمەش وایکرد کۆنگرێسی ئەمریکی کەمێك بسڵەمێتەوە لە چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ مەسەلەی ئەنگۆلادا و نەخاسمە لەڕووە مادیەکەیەوە ... ئەم ڕەوشە خۆی سەپاند بەسەر ئیدارەی ئەمریکادا ،ئەمیش بەڕۆڵی خۆی داوای

لەهاوپەیمانە ئەورووپیەکانی کرد تاکو هاوکاری مادی و سەربازی پێشکەش بکەن بۆ قەلاچۆکردنی کۆمۆنیزم لە ئەنگۆلادا .

وەلێ هیچ کەسێك بەئاشکرا بەدەم ئەم داواکاریەوە نەهات جگە هەندێك مورتەزیقەی بەریتانی کە بەرەزامەندی حکومەتی بەریتانیا نێردرانە ئەنگۆلا بۆ پێکدادان لەدژی بزوتنەوەی شەعبی مارکسی ... هەروەها دوو کۆمپانیای بەریتانی (کۆمپانیای ڕاکاڵ بۆ پەیوەندیەکان و کۆمپانیای تینی کیشاوەرزی) بەشداریان کرد لەهاوکاری کردنی ڕێکخراوی (یەکێتی نیشتمانی)لەباشوور بەکەرەستەو خواردەمەنی بۆ بەردەوام بوون لە کوشتاری شیوعی و نیشتمانیەکان ..سەرەڕای دەست تێوەردانی ڕاستەو خۆی ئەمریکا و باشووری ئەفریقا لەکاروبارەکانی ناوخۆی ئەنگۆلادا ،کەچی بزوتنەوەی شەعبی توانی لەساڵی ١٩٧٦دا جێپێی دەستەلاتەکەی قایم بکات و لەسەر هەردوو ئاستی ئەفریقی و نێو دەوڵەتیشدا شەرعیەت بۆ حکومەتەکەی مسۆگەر بکات .. ئەم مەسەلەیە بووە هۆی بەپەلە پاشەکشەکردنی ئەمریکا لە مەسەلەی ئەنگۆلادا ،لەپاش بڕیاری کۆنگریس بەوەستاندنی هاوکاری مادی بۆ ڕێك و پێك کردنی بارودۆخی ئەنگۆلا ... کۆشکی سپی دەست بەرداری هاریکاری کردنی ڕێکخراوی یەکێتی نیشتمانی و هاریکاری باشووری ئەفریقا بۆ پر چەك کردن و مەشق پێکردنی ڕێکخراوی ناوبراو نەدەبوو کەتاکو مێژووی بلاوکردنەوەی ئەم پەرتووکە لە گەڵ شیوعیەکاندا دەجەنگێت .. وەلێ سەبارەت بەڕێکخراوەکەی لەمەڕ ڕۆبرتۆ کەلەلایەن مۆبۆتۆ وە هاریکاری دەکرا، جەماوەری هێندە لەکەمی دەدا تاڕادەیەك تەنها ناوەکەی مابوو ،هیچ بوونێکی ڕاستەقینەی لەمەیدانی ململانێدا نەمابوو.

بەهەر حاڵ لەوکاتەدا هەندێك ناوەندی ڕامیاری وایان لێکدەدایەوە گوایە دەست تێوەردانی ئەمریکا پێویست بێت بۆ بەربەست کردنی بلاوبوونەوەی خێرای سۆڤیەت لەو کیشوەرە گرنگ و دەوڵەمەندەی سامانە سروشتیەکاندا..بەلام هەندێك ناوەندی تر وای دەبینی ئەوکردەوە نهێنیانەی کە (C.I.A) پێی هەڵدەستێت دژی بزوتنەوە

ڕزگاری خوازە نیشتمانیە ئەفریقیەکان،پەیوەندی هەندێك دەوڵـەتی ئـەفریقی بـە وڵاتـە یەکگرتوەکانەوە تێکداوەو بۆتە هۆی داڕوخانی بەها مرۆییەکانی ئەمریکا لەجیـهاندا .. بۆیە لیژنـەی کاروبارەکـانی موخابـەرات سـەربەئەنجومەنی پیرانی ئـەمریکا ئاکـامێکی دەستگیر بوو لە جەنگەکانی ئەنگۆلاوە ،ئاکامەکە بریتی بوو لەم ڕێژنـــە دەسـتەواژەیە: (ئـەو کردەوانـەی (C.I.A) پێـی هەڵدەسـتێت پێچەوانەیـە لەگـەڵ سروشـتی ئـەو مەبدەئانەی ڕابەرایەتی ئەمریکای لەسەر دامەزراوەبۆ جیهانی ئازادی و دیموکراتی)..

هەروەها لـەچەندین بۆنەی جیاجیادا کۆنگرێسی ئەمریکی دووپاتی ئەوەی کردۆتـەوە کەبزوتنەوە ڕزگاریخوازەکانی ئـەفریقا شۆڕشـی نیشـتمانی بـوون لـەپێناوی وەدەسـت هێنانی ئـازادی و سـەربەخۆییدا بـەرپابوون ،وەڵێ دەسـت تێوەردانـەکانی (C.I.A)و ئیدارەی ئەمریکا وایکرد شۆڕشەکان ببنە هاوپەیمانی سۆڤیەت و ئـەو پـەڕی پێویسـتیان بەیارمەتی و هاوکاری ئەو هەبێت ، هەروا لەبواری توانج دان لەسیاسەتی (واشنطن)لە ئـەفریقادا ،زامبیـا لەنێوەڕاسـتی حـەفتاکاندا گووتـی:(ئـەو کودەتـا سـەربازیەی کـە (C.I.A) لـە زائـیر بـەرپای کـرد ،تەکـــەهوناتی زۆرێـــك لەڕابـــەرانی ئـــەفریقای سەلماندکەلەپشـتی هەرکودەتایـەکی سـەربازی سـەرکەوتووەوە ،دەســـتی ڕۆژئـــاوای لەپشتەوە دەبینین دەیجولێنن).لەلایەکی ترەوە (C.I.A) هەستا بەچــەند کردەوەیـەکی سـیخوڕیلەناوچەی ڕۆژهـەڵاتی نـاوین دا لـە هـەولێکی دا بـۆ مسـۆگەرکردنی دوو ئامانجی ئیستراتیژی بۆ وڵاتە یەکگرتوەکان .یەکێك لەو ئامانجانە دەستگرتن بوو بەســەر پاشماوەو میراتیەکانی پادشانشینی بەریتانی و دوور خستنەوەی سۆڤیەت لەدەست گرتن بەسەر ئەو میراتە گرنگەدا ،کەبەنرخ مەزەندە نـاکرێت .. وەڵێ ئاگـادارانی کاروبـاری موخابەرات یەکدەنگ بوون لەسەر بە(شکست خواردوو)لەقەڵەم دانـی ئـەو هەوڵانـە ،لەبەر چەندین هۆکار گرنگرتلاینیان خەفڵاندنی پێشهاتەکانی دوای جەنگی گەردوونی دووەم،وەتێنەگەیشـتن لــە سروشـتی بزوتنـەوە ڕامیـاری و نیشـتمانی و نەتەوەییـەکان لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا .. ساڵی ١٩٥٣ (C.I.A) پشتگیری کرد لـە شۆڕشـەکەی

رابەری نیشتمانی مصر (جمال عەبدولناسر) لەدژی شا فاروق، هاوڕێو دۆستی پادشا نشینی بەریتانیا، بەو هیوایەوە کە عەبدولناسر ئامادە بێت داگیرکەرێکی موحافیزکاری بەریتانی بگۆڕێتەوە بەداگیرکەرێکی لیبراڵی ئەمریکی، بەڵام رابەری مصری ئەمریکیەکانی هیوا روخاوکرد لەکاتێکدا لەساڵی ١٩٥٥وە دەستی کرد بەوەرگرتنی هاوکاری سۆڤیەتی لەهەموو ئاستەکاندا، ئەوەش وایکرد لەفۆستر داڵسی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لەوکاتدا کیم رۆزفیلتی پیاوی CIA تاکو سەردانی قاهیرە بکەنو لەگەڵ عەبدەولناسردا کۆبوونەوە گرێ بدەن، لەدواهەوڵیاندا بۆ قەناعەت پێکردنی عەبدولناسر تاکو پەیوەندی بکات بەو هێڵە نوێیەی کەئەمریکا لەجیهاندا کێشاویەتی.. ئەوەبوو هەوڵەکانی ئەو دوو پیاوە شکستی هێنا لەقەتاعەت پێکردنی سەرۆکی مصردا کەپەیوەندیەکانی لەگەڵ کرملیندا توندوتۆڵ کردبوو، پاش راوەستاندنی وڵاتە یەکگرتووەکان لەتەمویل کردنی بەنداوی ئەسوان، هەروەها بڕیاری خۆماڵی کردنی نۆکەندی سوێنسی کردو بەهاوکاریو تەمویلی سۆڤیەت دەستی کردەوە بەکارکردن لەپرۆژەی کەنداوی ئەسواندا.

لەساتو سەودایەدا کە CIA هەوڵی چاککردنی پەیوەندیەکانی دەدا بەحوکمی نوێوە لەقاهیرە، موخابەراتی ئیسرائیلی کەناسراوە بەمۆساد چالاکانە کاری دەکرد بۆ جێبەجێکردنی پلانە سیخوڕیەکەی کە لەژێر شیفرەی (پرۆژەی سۆزانی)دا ناونرابوو، بەئامانجی تێکدانی هەر پەیوەندیەك کەئەگەری سەرهەڵدانی هەبێت لەنێوان ئەمریکاو قاهیرەدان گەر نەڵێین تێکدانی لەنێوبردنو سڕینەوەی پەیوەندی ئاسایی نێوان هەردوو دەوڵەتەکە.. لێرەوە مۆساد هەستا بەهێنانە ژێرباری ژمارەیەك هاووڵاتی مصری بۆ لێدانی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لەمصرداو تیرۆرکردنی دیبلۆماسیە ئەمریکیەکان لەمصر، لەهەوڵێکدا بۆ لکاندنی ئەو تۆمەتانە بەرژێمی نیشمانی مصر.. بەڵام ئەو هاووڵاتیانە مصریانە لەچرکە کۆتاییەکاندا پەشیمان دەبوونەوە لەناپاکی کردن بەرامبەر نیشتمانو شۆڕشی مصریو پرۆژی سۆزانی

ئیسرائیلیان جێبەجێنەدەکرد.. کەچی پێشهاتەکەی داهاتوو خزمەتی پلانە تێك دەرانەکەی مۆسادی کردو، CIAی بەجۆرێك لێنزیك کردووە کە هەندێك لەچاودێران وەسفی مۆسادو موخابەراتی ئەمریکا بە(دووانە خۆشەویستەکە) بکەن!! لەلایەکی ترەوە مۆساد، لەساڵی ١٩٦٠دا ئاگاداری ئەوەی وەرگرت ژەنراڵ مەحمود خەلیل بەڕێوەبەری پێشووی موخابەرات لەهێزە هەواییەکانی میسردا، توانیویەتی ٢٦ زانای فڕۆکەوانی و ڕۆکێت قایل بکات (لەنێو ئەو زانایانەدا دکتۆر یۆجین سانگر لەپەیمانگای لێکۆڵینەوەی تایبەت بەفڕۆکەی فیشکەدار لەشتوتگارت) بۆ پەیوەندی کردن بەپرۆژەی بەرهەمهێنانی ڕۆکێتی میسری ئەو پرۆژەیە حکومەت بەهاوکاری لەتەك چەندین کۆمپانیای وەهمیدا کارسازی بۆکردبوو لەنێوانیاندا کۆمپانیای (انترا هندل) لەمیونخ و شتوتگارت، لەئاکامی ئەم زانیاریانەدا مۆساد (وولف گانگ لوتز)ی ئەڵمانی نەژادی بەکریگیراوی خۆی ڕاسپارد بەسیخوڕی کردن بەسەر پرۆژەکەی میسرەوە وەك سەرەتا دروست کردنێك بۆ لێدان و تەقاندنەوەی بەرلەوەی کار لەکار بترازێت، لەوکاتەدا لۆتز، وەك هەر یەکێك لەبەکرێگیراوە نهێنییەکان هەستا بەگەشتێك بەئەوروپادا ئینجا لەپاریسەوە چووە قاهیرە، لەوێندەرێوە لەساڵی ١٩٦١دا توانی دزە بکاتە نێو جالیەی ئەڵمانیەکان و زانیاریەکی زۆری دەست بکەوێت دەربارەی پرۆژەی دروستکردنی ڕۆکێتە میسریەکە.

وەلێ موخابەراتی میسری لەساڵی ١٩٦٥ بۆ ماوەی دوو ساڵ دەستگیری کرد، لەدوایدا لەگەڵ ٨ بەکریگیراوی تری ئیسرائیلیدا بەرەڵڵا کرا لەبەرامبەر بەرەڵاکردنی ٥٠٠٠ پێنج هەزار سەربازی میسریدا، کە لەشەڕی ساڵی ١٩٦٧دا سوپای ئسیرائیلی بەدیلی گرتبوونی.

لەئێرانێش CIA هەڵەی کرد لەخەملاندنی ئەو بارودۆخەدا کەوڵات پیایدا گوزەری دەکرد لەو ساتەوە کە شا گەڕایەوە بۆ دەسەلات لەساڵی ١٩٥٣دا سەرەڕای گرنگێتی ئەو هاوپەیمانە موحافیزکارە لەکارئاسانی کردن بۆ کردەوە سیخوڕیەکان و گوێ شنەوتن کەموخابەراتی ئەمریکا لەدژی سۆڤیەت پەیڕەوی

دەکرد لەبنکەی (کابکـان بهشـار)ی بـاکوری ئێرانـەوە ،کـەچی (C.I.A) سـنوری مـاقوڵی بەزاندلەچاوپۆشـی کـردن لەدڕنەیـەتی قوتابیـە بەنازەکـەی (سـاڤاك)دا،واتـە موخابەراتی ئێران کە دزێوترین مامەڵەی لەگـەڵ بەرهەڵسـتکارە ڕامیاریـەکانی وڵاتـدا دەکـرد.. هـەروەك چـۆن (C.I.A) کەوتـە هەڵـەوە لەمەزەندەکردنیشـەعبیەتی ئیمام(ئایەتوڵڵا خومەینی)دا ،کەڕابەرایەتی شۆڕشی ئیسـلامی گرتـە دەسـتو لەسـاڵی (١٩٧٩)داسەرکەوتنی بەدەست هێنا لەتێك وپێك شکاندنی ساڤاك و ڕژێمـی ڕاسـت ڕەوی موحافیزکار لەئێراندا .

(شۆڕشی ئێران بوو بەهۆی شەڕی شەقامەکان لە شارەکانی ئێراندا ،لەم وێنەیەدا دیمەنێکی ئەم جەنگە لە شاری خوڕەمشـەهر دا دەردەکەوێت)

لێرەدا پێویستە ئاماژە بدەین بەوەی سەرۆك (کارتـەر)تاکـە سـەرۆکی ئـەمریکا بـوو لەڕیزی ئەوسەرۆکانەدا لەساڵی ١٩٥٣ وە هاتونەتە سەرکورسی حوکم لەئـەمریکادا ،کە ئاماژەی دابێت بەمەترسی سیاسەتەکانی شاو موخابەراتەکەیی وهەوڵی داوە فشاری بخاتـە سـەر بـۆوەی مامەڵـەی خـۆی لەتـەك نـەیارەکانیدا بگۆڕێـت ،بـەڵام

ئاگادارکردنەوەکانی چونکە درەنگ وەخت بوون،نەیان توانـی رێگـە بگـرن لەگەنجـە موسوڵمانەکان لەئێراندا تاکو دەست نـەگرن بەسـەر بارەگـای باڵوێزخانـەی ئـەمریکا لـەتاران و دەسـت بەسـەردا گرتنـی کارمـەندانی باڵوێزخانەکـە بۆماوەیـەکی دورو درێژ،دیسانەوە ئەویش (C.I.A) ناچـارکرد تـاکو کردەوەیـەکی پوچـەڵ بکـات بـۆ رزگارکردنی بارمتەکان ،لەئەنجامدا گرێ کۆڵەی پەیوەندیەکانی نێـوان هـەردوو وڵات پتر ئالۆزبوو لەبری ئـەوەی بـە ئاشـتیانە چارەسـەر بکرێـت ،یـاخود رێ لـەڕوودانی بگیرێت بەرلەوەی کار لەکار بترازێت .

لە کۆتاییدا پێویستە بڵێین هەڵسو کەوتـە (هـەندێك جـار خۆهەڵقورتێنـەر)هـەندێك جـاریش زارۆییـەکانی (C.I.A) ،خزمـەتی موخابـەراتی سـۆڤیەتی و سیاسـەتەکانی (کرملین)ی کرد لەڕۆژهەڵاتی ناوەراست و ئەفریقادا،چونکە لەبری ئـەوەی بزوتنـەوە رزگاریە نیشتمانیەکان بقۆزرێنەوەو لەئاراستەی ڕەوتی دیموکراتیدا هاوکاری و تەبەنیان بکات،(C.I.A) کاری کرد بۆ گۆڕین،یان هەوڵی گۆڕینـی ئـەو بزوتنەوەنیشـتمانیانە ،بەرژێمانێکی سـەربازی ڕاسـت ڕەو کەگاڵتـەی دەکـرد بەئاسایشـی هاوڵاتیـەکانی و سەربەستی و ئازادیشیان ،بوشنە هۆی لەکەدارکردنی ناوبانگی ووڵاتـە یـەکگرتوەکانی پێشرەوی جیهانی ئازاد.

بەشی حەوتەم

# ﴿هندی چینی﴾

لەدوای سەرکەوتنی کۆمۆنیزم لەچین لە ساڵی ١٩٤٩دا ،و داگیرکردنی کۆریای باشوور لەساڵی (١٩٥٠)دالەلایەن شیوعیەکانی کۆریای باکورەوە،وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هەستی کرد ناچاربووە بەوەی سنورێك دابنێت بۆمەترسی بڵاوبونەوەی کۆمۆنیزم لە جیهاندا ،بەجۆرێك لەرۆژهەڵاتی ئاسیاوە دەست پێبکات و لە ئەمریکای لاتینی دا کۆتایی پێ بێت .. و بە ئەوروپاو رۆژهەڵاتی ناوەراست و جیهانی ئەفریقی دا گوزەر بکات... لەبەر ئەوە (C.I.A) لەچوارچێوەی زنجیرە پلانەکانیدا ،پلانێکی دارێژرا بۆ بنەبڕکردنی شیوعیەت لە چین و دەوڵەتە ژێردەستەکانی فەرەنسا لە هندی چینی دا واتە وڵاتانی لاوس ،کمبودیاو ڤێتنام ،بۆ گونجان لەتەك ئەم نەخشەیەدا ،(C.I.A) هەوڵی دا لەساڵی ١٩٥٣ دا،هەڵمەتێکی پروپاگەندەیی –رامیاری لەنێو خۆیی چین دا رێك بخات بەئامانجی روخاندنی رژێمی شیوعی بەرابەرایەتی (ماوتسن تۆنگ)،بەڵام پلانەکە بەرلەوەی سەری لەهێلکە بجوقێت (دەربرینی وەرگێری کوردیە)مرداربوویەوە،بەوەی لەنێو چین دا دوو بەکرێگیراوی (C.I.A) بەناوی (جۆن دۆنی) و (ریتشارد فکتۆ) دەستگیرکران.

لەئاکامی ئەم نشوستیەدا (C.I.A) جامی گرنگی دانی خۆی رۆکرد بەسەر هیندی چینی دا بۆ رێگەگرتن لە گەشتنی شیوعیەکان بەدەستەڵات ،لەمیانەی ئەو شەرە پارتیزانیەی سەرکەوتوانەوە کەلە دژی داگیرکەری فەرەنسا هەڵیان گیرساندبوو،کەلەپاش شکستیەکەی (دیان بیان یو)لەباکوری ڤێتنام لەساڵی (١٩٤٥ز)دا ئەو وڵاتەی بەجێ هێشت ...فەرەنساییەکان کە وڵاتەکەیان بەجێ هێشت

جلەوی حوکمیان دایە دەست کۆمەڵە گرووپێکی ڕاست ڕەوی توندڕەو ،کە ڕاستەوخۆ هاوپەیمانیان لەگەڵ وولاتە یەکگرتووەکاندا بەرپاکرد،لەکاتێکدا ئەمی کۆتایی فرە بەپەرۆش بوو بۆگرێدانی هاوپەیمانی لەگەڵ هەر دوژمنێکی شیوعیەت دابا هەرچی خەسڵەتێکیشی هەبوو بێت هەرلەو ماوەیەدا ئایزەنهاوەری سەرۆکی ئەمریکا (کۆلۆنێل ئیدوارد لانسداڵ یەکێك لە کۆنە پیاوەکانی) (نوسینگەی خزمەتگوزاریە ئیستراتیژیەکان)ی ڕاسپارد بۆ هەڵبژاردنی ڕابەرێکی ڤێتنامی کەتوانای هەبێت بەربەرەکانیی(هۆشی منە)بکات.

بەگوێرەی دان پێدانانیخودی سەرۆك ئایزنهاوەر کەلە یاداشتەکانیدا دەڵێت:(هەموو ئەوانەی وتووێژم لەگەڵدا کردوون لەبارەی ڕەوشی ڤێتنامەوە کەزۆربەشیان پسپۆر بوون لەکاروباری هیندی چینی دا ،دووپاتیان بۆ کردوومەتەوە کە(هۆشی منە)دەتوانێت پتر لە (٨٠٪)دەنگی ڤێتنامیەکانبەدەست بێنێت لەساتە وەختێکدا گەر هەڵبژاردنی سەربەست و ڕاستەقینە لەو وڵاتەدا بێتە ئاراوە)...

لەدوای ڕاسپاردنی بەو ئەرکە (لانسداڵ)بینی سەرۆکی ئەو دەمەی حکومەتی ڤێتنام باشترین ڕابەری ڕاستڕەوە بۆ ڕێکردن لەگەڵ کاروانگەی ئەمریکادا ...بۆیە وای بینی گواستنەوەی هاوکاریە مادی و سەربازی تەواوەکان بۆ نێو هەگبەکەی ئەم کابرایە زۆر باشترەلە دابەشکردنی بەسەر گرووپە ڕاستڕەوە جۆراوجۆرەکان یاخود کەسایەتیە ئیئتلافیە حکومیەکان ،هەروەها پێشنیاری سەرۆکی پێشووی ئەرکانی ئەمریکا ژەنراڵ(لۆتۆن کولینز)یشی کرد... جگە لەوەش (لانسداڵ)پێی وابوو کارتی جیاوازی طائیفی لەنێوان کەمایەتی کاسۆلیکی و زۆرایەتی بوزی لە ڤێتنام دا خزمەتی مەرامەکانی (واشنطن)دەکات لەقاڵب دانی (هۆشی منە)و ڕۆڵی شیوعیەکان لەباکوری وڵاتدا ... لەبە ئەوە (لانسداڵ)بەهاوکاری (C.I.A) دەستی کرد بەئامادەکردنی هەڵمەتێکی پالانتەو درۆ بلاوکردنەوە لە ڤێتنامی باکوردا ،سەرەڕای چاندنی ترس و دڵە ڕاوکێ لەناخی کەمینەی کاسۆلیکی وڵاتدا لەڕێگەی چیرۆك و گێڕانەوەی

جۆراوجۆرەوەکەهانی پتر لە (٨٠٠هەزار)کەسیان دا کۆچ بکەن بۆ ڤێتنامی باشوور لەگەڵ ئەوەشدا خەونەکانی (لانسدال)وەك خۆی هیوای دەخواست نەهاتە دی.
ئەوەبوو شەعبیەتی (هۆشی منە)زیادی کرد و بەرەو بەشی باشووریش درێژبوویەوە، دوای ئەوەی بۆ ڤێتنامیەکان ئاشکرابوو سەرۆك وەزیرانی بەشی باشوور (نگودین دیام)چنیە،جگە بووکە شوشەیەك بەدەستی ئەمریکیەکانەوە کەبەڕۆڵی خۆیان یارمەتی دیکتاتۆرێکی ستەمکار دەدەن ،شیاوی باسە وڵاتە یەکگرتوەکان لەنێوان سالانی (١٩٥٥-١٩٦٠)دا ،یەك بلیۆن دۆلاری ئەمریکیان وەك هاوکاری دابوویە رژێمی (دیام)وبراکەی(نگودین نهۆ)کە ڕاستەو خۆ لە ڤێتنامدا خزمەتی (C.I.A) ی کردبوو،ڕۆڵێکی گرنگی بینی بوولەکاروبارەکانی ناوخۆی وڵاتدا ..هەروەها پێویستە بێژین (دیام)لەتشرینی یەکەمی ساڵی(١٩٥٥)دا لەدوای هەڵبژاردنێکی ساختە توانی دەستەڵات بەسەر تەواوی وڵاتدا بگەیەنێت... ئەنجامی هەڵبژاردنەکە یاریدەی (دیام)ی‌دا تاکو ئیمپراتۆری لاوازی ڤێتنام لەوکاتەدا(باودای)لەکار بخات.

لەگەڵ دەستپێکردنی ساڵی (١٩٥٩)دا شیوعیەکان جەنگێکی پارتی زانی سەرکەوتویان دژی ڤێتنامی باشوور دەستپێکرد ،توانیان سەرەڕای هاوکاریەکانی ئەمریکا بۆ ڕژێمەکەی (دیام)چەند گوندێکی سەرسنوری نێوان هەردوو ڤێتنام کۆنترۆڵ بکەن ،(ولیەم کولبی)بەڕێوەبەری تۆڕی (C.I.A) لە (سایگۆن)هەوڵی دا دەرك بکات بەمەترسی ڕەوشەکە لەڕێی ڕێکخستنی ئەو پرۆژەیەی ناونرابوو (پرۆگرامی هملتی ئیستراتیژی)بەمەبەستی قایم کردنی ئەوگوندانەی هاوسنورن لەتەك ناوچەکانی نفوزی شیوعیەکاندا لەباکور،و مەشق پێکردنی لاوان لەسەر بەکارهێنانی چەکوکوشتارکردنی گەریلا پارتیزانەکان،بەلام پرۆگرامەکە بەفەزڵی سیاسەتەکانی دیکتاتۆری گچکە (نگۆدین نهۆ)(برای دیام)ەوەگۆڕا بۆ پرۆگرامی ڕەش بگیری کۆمەڵی،لەگەڵیشیدا گوندە سەرسنوریەکان بوونە کامپی بەر فراوانی دەستگیر کردن و تیایدا گروپە شەعبیە نەیارەکانی ڕژێمی دەستەلاتدار دەستگیرکران و بەو جۆرەش

جەماوەری (هۆشی منە)زیادی کرد.هەروەها کولیی هەولّی مەشق پێکردنی هۆزە ڤێتنامیەکانی لەناوچە شاخاویەکان و پرچەك کردنیانی بەچەکی پێویست بۆ قەلاّچۆکردنی بلاّوەکردنی کۆمۆنیزم دابوو.

هاولاّتی‌یەکی بووزی ئاگری لە جەستەی خۆی بەرداوە لە سالّی (١٩٦٣) دا بۆ ڕیسوا کردنی سیاسەتەکانی دیکتاتۆر (دیام) دژی بوزی‌یەکان لە ولاّتدا... ئەم وێنەیە کاری کرد لە ڕای گشتی جیهانی و کۆنگریسی ئەمریکی هێنایە سەر ئەو بڕوایەی کە زەروورە دەست هەلّ بگرێت لە پالّپشتی کردنی ڕژێمەکەی (دیام).

بەلاّم ئەو پێشهاتە دراماتیکیانەی لە ڤێتنامی باشووردا ڕوویان دانەخاسمە ئەوانەیان کەپەیوەندیان بەسیاسەتەکانی (دیام وبراکەیەوە)هەیە بوونە هۆی سەرنەکەوتنی ئەو هەولاّنەی کەدەرکران بۆ سازکردنی جەماوەری لە دژی هۆشی منە ... لێرەدا پێویستە ئاماژە بدەین بەوەی دیام کاسۆلیکی بوو،سیاسەتەکانیشی کە پشتگیری دەکرد لە (واشنطن) بویە هۆی ڕق هەستانی زۆرینەی هاولاّتیانی ولاّت کە بوزین لەم ڕوانگەیەشەوە بوزیەکان هەولّە پروپاگەندەیەکانیان لەدژی دیام و براکەی پەرەپێدا لەسەرەتای شەستەکانەوە تاکو ڕادەیەك ئاپۆڕەیەکی زۆریان خۆپیشاندانێکیان لەبەردەم مالّەکەی دیام دا سازدا بۆ نارەزایی دەربڕین بەرامبەر شەوانە دەستگیر کردنی بەکۆمەلّی بوزیەکان لەلایەن هێزە تایبەتەکانی ڕژێمەوە ،بەسەرۆکایەتی نهۆ .. وەلێ ئەو

هێزانە ڕێژنەی گوللەیان کردە ئاپۆڕەی خۆپیشان دەران لەساڵی ١٩٦٣ دا، و ژمارەیەکی گەورەشیان لێ کوشتن ،بەو هۆیەوە ئەمریکیەکان و کۆشکی سپی لەناو خۆو دەرەوەدا قەڵس و تووڕە بوون .. هەروەها ئەو هێزانە هێرشیان کردە سەر پەرستگای بوزیەکان لە وڵاتدا و،زۆرێکیان لە (نساك)ەکانیان گرتن کە هەندێکیان ناچاربوون لەدژی سیاسەتەکەی دیام و وولاتە یەکگرتوەکان لە گۆڕەپانە گشتیەکان ئاگر لەجەستەی خۆیان بەربدەن .

لەتشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٣دا ،کۆمەڵێك لەئەفسەرانی ڤێتنامی باشوور توانیان دەست بگرن بەسەر وڵاتدا لەڕێگەی کودەتایەکی سەربازیەوە کە بە هۆیەوە(دیام و براکەی)گیانیان لە دەست دا...وەتاکو مێژوی ئێستامان ،پەنجەی تاوانبارکردن درێژ دەکرێت بۆ ڕۆڵی (C.I.A) لەتیرۆر کردنی هەردوو براکە دیام و سەرکەوتنی کودەتا سەربازیەکە دا.بەتایبەت کە ڕیسواییەکەی (أوراق البنتاغون)لەم ڕووەوە دۆکیومێنتی گرنگی ئاشکرا کرد و دوپاتیشی کردەوە سەنتەری سەرەکی (C.I.A) لە وڵاتە یەکگرتوەکان تەعلیماتی دەرکردووە بۆ باڵوێزی ئەمریکا لە ڤێتنام (هنری کابوت لوج)بەوەی بەردەوام بێت لە ڕەتکردنەوەی ئەو تۆمەتانەی دەدرێنە پاڵ (C.I.A) لە مەڕ هاوکاری کردنی ئەفسەرانی کودەتاکە ،هەروەها دۆکیومێنتەکان پەردەیان لادا لەڕووی ئەو پەیوەندیە تۆکمەیەی (C.I.A) دەبەستێتەوە بە کودەتا چیەکانەوە ... سەرەڕای ناڵەباری هەڵوێستی گشتی لە وڵاتدا ،ئەمریکا یەکبینە بوو لەیارمەتی دانی حکومەتی ڤێتنامی باشورو ناردنی پێداویستی و چەك و سەرباز بۆ ڤێتنام ی هەژار بەو گومانەی گوایە پارچەیەك شیرینیەو قوتدانی زۆر ئاسانە.. بەڵام شیرینیەکە لە قورگی ئەمریکادا گیراو دەنگی تاساند،وەك ڕابەری جیهانی ئازد... هەرلە شەستەکاندا (C.I.A) لەوڵاتی(لاوس)گلا لە چەند کردەوەیەکی نهێنی یەوە ،ئەوەبوو لەدوای پاشەکشەی فەرەنسیەکان لە ساڵی (١٩٥٤ز)دا،جڵەوی حوکم لەلایەن (سۆڤانا نۆما)وە گیرایە دەست کەسەردەستەی حکومەتێکی میانەڕەوی دەکرد و

لەساڵی (١٩٥٨)دا قایل بوو بە بەشداری کردنی شیوعیەکان لەدەستەڵاتدا ،پاش ئەوەی (باثیت لاوا= حیزبی شیوعی)سەرکەوتنی ڕامیاری و ئینتخابی زۆر گرنگی لەوڵاتدا بەدەست هێنا... هەرچەندە لەو کاتەدا (C.I.A) قایل نەبوو بەبەشداری کردنی شیوعیەکان لە کابینەی حکومەت دا ،بۆیە بڕیاری دا یارمەتی گروپە ڕاست ڕەو توندڕەوەکان بدات بۆ بەرهەڵستی کردنی شیوعیەکان ،بۆ ئەم مەبەستە کۆمەڵە ئەفسەرێکی ڕاست ڕەو هەڵبژێردران ،لەنێوانیاندا ژەنراڵ (فۆمی نوسافان)دەبینرا کەتوانی لەساڵی (١٩٥٨)دا جڵەوی دەستەڵات بگرێتە دەست و (باثیت لاوا)یشی ناچارکرد بەئاشکرا حیزبەکە هەڵبوەشێنێتەوە و پەنا بەرێتە بەر شەڕی پارتیزانی نهێنی .

لەئەنجامی ئەم ڕوداوانەدا کەبارودۆخی ناوخۆی وڵاتی (لاوس)ی تێکدا. کودەتایەکی سەربازی تر لەدژی ژەنراڵ(فۆمی)پیادەکرا،لەو کودەتایەدا نەقیبێکی سوپا کەتەمەنی (٢٦)ساڵ بوو بەناوی (کۆنگ لاپە)توانی دەستەڵات بگرێتە دەست و بانگێشی ئەمیر (سڤانا)ی کرد تابگەڕێتەوە و وەك سەرۆکی حکومەت دەست بەکاربێتەوە .هەرچەندە ئەم کودەتایە نەیتوانی بەتەواوی زاڵ بێت بەسەر ژەنراڵ فۆمی دا چونکە ئەو بەهاوکاری (C.I.A) بەتایبەت هاوڕێی خۆشەویستی لە (C.I.A) دا (جاك هنری)بەسەر بەشی باشوری لاوس دا زاڵ ببوو.

لەکاتێکدا نەقیبی لاو هەوڵی دەدا قەناعەت بەئەمیر بکات ،بەزەرورەتی پێکهێنانی حکومەتێکی ئیئتیلافی نیشتمانی کە هەموو گروپە لێك جوداکان بگرێتە خۆ بە کۆمەڵەکەی فۆمی و شیوعیەکانیشەوە ،(C.I.A) هێشتر پێداگربوو لەسەریارمەتی دانی فۆمی و سیاسەتە ڕەفزکەرانەکەی بۆ هەر ئیئتیلافێك لەتەك شیوعیەکاندا ... سەرەڕای بانگێشەکانی باڵوێزی ئەمریکا لە لاوس (وینتروب براون)بۆ پێکهاتنەوەی نیشتمانی لەنێو هەموو گروپە ناکۆکەکاندا کەچی (C.I.A) سەرقاڵی قایل کردنی ئەمیر (سۆڤانا)بوو بەوەی دەست بەرداری هەڵوێستە میانەڕەوەکەی بێت و شەڕ لەسەر (باثیت لاو-حیزبی شیوعی)ڕابگەیەنێت،لەپێناوی ئەوەدا هاوکاری مادی و سەربازی

له (واشنطن)ەوە دەستگیربێت...وەلێ(سۆڤانا) مامەڵـەکردنی لەتـەك سـۆڤیەت دا پـێ باشتر بوو لەبەرچەندین هۆکار دیارترینیان خۆشحاڵی ڕای گشتی (لاوس)بوو بەمامەڵـە لەتەك ڕووسەکاندا و ئەمیش بەڕۆڵی خۆی هاوکاری (سۆڤانا)وشیوعیەکانی کرد،دژی دەسـت تێوەردانـەکانی چـین و ئـەمریکا لـەلاوس دا ... یەکـەم فرۆکـەی سـۆڤیەتی کەکەرەستەی خۆراکـی و سـەربازی هـەڵگرتبوو لەسـاڵی(١٩٦١)دا لـــە(هــانۆی ڤێتنامەوە) گەیشتە باکوری لاوس .

کاردانـەوەی فۆمـی لەسـەر ئـەم ڕوداوە زۆر تونـدو تیـژو کاریگـەر بـوو ئـەوەبوو بـەهاوکاری (C.I.A)توانـی شـاری (فینتیـان)ی پایتـەختی لاوس کۆنـترۆڵ بکـات و هێزەکانی (سۆڤانا) و نەقیب (لاإیە)ی هاوپەیمانی ناچار کرد بەرەو بەشە بـاکوری لاوس پاشەکشە بکەن ... هەردوو گروپەکە هێندەی نەبرد ڕیزەکانی خۆیان ڕێکخستەوەو لە هاوکاریەکی شێوە گشتگیردا لە گەڵ شیوعیەکاندا بەپاڵپشتی ڤێتنام توانیـان بنکەیـەکی هەوایی داگیر بکەن لەناوچەی(بلاد جار)دا کەتەنها (٥٠میل)لە سنورەکانی ڤێتنامـەوە دوورە .. ئەم کردەوەیە کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر گۆڕانیتـەرازوی هێزەکـان لە لاوس دا ،ڕوەو سەقامگیرکردنی جێ پێی هاوپـەیمانانی (مۆسـکۆ) لـەو ولاتـەدا لـە هەمان کاتدا سەرۆك (جۆن کنیدی)پۆستی سەرۆکایەتی لە (واشنطن)گرتبوویە دەسـت لەدوای ئاهەنگی کردنەوەی پەیمانگای نوێ لە (١٩٦١/١/١٩)دا .

لەیەکەمین هەنگاوی بەکردەوەیدا سەرۆك (کنیدی)داوای کرد لـــە (کەشـتی گـەلی) ئوسطولی حەوتەمی دەریاوانی ئەمریکا ، تاکو لە ڕۆخەکانی لاوس دا نزیك بکەوێتــەوە ،تاڕادەی هاویشتنی تۆپی مەدفەعی لـــە کەشـتیەکانەوە ،بـۆ ئامادەباشـی وەرگرتـن بـۆ ڕووبەڕو بوونەوە لە گەڵ هەریاخی بونێکی شـیوعیەکان لـەولاتی لاوس ... وەلێ ئـەم پلانە بوویە هۆی قەڵس کردنی هاوپەیمانەکانی (واشنطن)و ئەندامانی پرۆتۆکۆلی باشوور – ڕۆژهەلاتی ئاسیا ،یاریدەدەرانی سـەرۆك (کنیـدی)یـش پەسـتبوون چونکـە ئـەوان لەلایەکی ترەوە لەسەر داواکاری سەرۆك پلانێکیان داڕشتبوو بۆ تێوەگلانی هاوپەیمانــە

ڕۆژئاواییەکان لەشەڕێکەوە دژی یاخی بوانی لاوس لەژێر پەردەی ڕێکخراوی (پەیمانی باشووری –ڕۆژهەلاَتی ئاسیا)و ڕەزامەندی سەرجەم ئەندامەکانی ...

بەکردەوە هەنگاوەکەی سەرۆك (کنیدی)شکستی خۆی سەلماند لەبواری هاوکاری لەتەك دەولەتە دۆستەکاندا ،ئەوەبوو هەریەك لە فەرەنساو بەریتانیا ملە جەڕێیان کرد لەپالپشتی کردنی بڕیارەکەی (کنیدی)ویارمەتی دانی سەربازی ئەو بڕیارە لەبەرەی ڕۆخەکانی لاوس دا سەرۆك (کنیدی)لەوتارێکی تەلەفزیۆنی دا ڕۆژی (١٩٦١/٣/٢٣)وەلاَمی هەلویستی هاوبەشی فەرەنساو بەریتانیای دایەوەو ووتی (دەولەتە ڕۆژئاواییەکان خۆیان دەبینن چۆن ناچاردەبن بەدووبارە بیرکردنەوە لەبڕیاری دەست تیۆرنەدانەکەیان، لەکاتێکدا شیوعیەکان هێرشی کۆتاییان دەست پێدەکەن بۆسەر لاوس ،بەمەبەستی لکاندنیەوە بە هاوپەیمانیەتیەکەی سۆڤیەتەوە) لەلای خۆیانەوە، ڕابەرانی (کرملین)قایل بوون بەپێشنیارێك بۆ بەستنی کۆنفرانسێکی نێو دەولەتی سەبارەت بەلاوس ،وەناوەند گیری بەریتانیا بۆ ئاگربڕ لەنێوان لایەنە پێك هەلپژاوەکانی ئەو ولاَتەدا .

بەو جۆرە ١٤ دەولەت لە ئایاری (١٩٦١)دا کۆنگرەیەکیان لە (ڤیەننا)دەربارەی ڕەوشی ناکۆکیەکانی (لاوس)گرێدا ،لە میانەیدا ئەمیر(سۆڤانا)داوای دامەزراندنی حکومەتێکی کرد کە سەرجەم لایەنە ناکۆکەکان بە شیوعی و گروپەکەی (فۆمی)شەوە تیایدا بەشداربن .. وەلێ ژەنراڵ(فۆمی)جارێکی تر بەشداری کردنی شیوعیەکانی ڕەتکردەوە بەو هیوایەی (C.I.A) بەردەوام بێت لە هاوکاریکردنی لە پێناوی دەستەلاَت سەپاندن بەسەر جیهاندا وەلێ ڕەشەبا بەپێچەوانەی ئاواتی کەشتیەکانی (فۆمی)یەوە هەلی کرد، ئەوەبوو (جۆن ماکون)بەڕێوەبەری (C.I.A) لەوکاتەدا فەرمانی بەهەموو پیاوەکانی دا لەناوچەکانی نفوزی (فۆمی)بکشێنەوە و (فۆمی) وپیاوەکانی بەجێ بهێلن لەبەردەم جەنگی پارتیزانی شیوعیەکاندا.

هەروەها باڵوێزی ئەمریکا لەلاوس ئاگاداری دا بە ژەنراڵ (فۆمی)لەمەڕ بەرەنجامەکانی هەڵوێستە ڕەقەکەی دەربارەی دیالۆگی نیشتمانی کراوەو داواشی لێکرد بەرلەوەی هەلی لەکیس چێت دووبارە بیر لە مەسەلەکە بکاتەوە ... پاش ماوەیەکی کەم بۆچوونەکانی باڵوێزەکەی ئەمریکاوە بەڕاست گەڕان ،ئەوەبوو شیوعیەکان توانیان کۆنترۆڵی ناوچەیەکی پان و بەرین بکەن کە پێشتر لە ژێر کۆنترۆڵی ژەنراڵ دا بوو ،بەوەش ناچاریان کرد مل بدات بە وتو وێژی نیشتمانی ،لە ئەنجامدا لە ڕۆژی (١٩٦١/٧/٢٣)لایەنەکان ئیمزایان کرد لەسەر بنەماکانی دیالۆگی نیشتمانی .

لە تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا (واشنطن)(٦٦٦)پسپۆڕو ڕاهێنەری سەربازی لەو ناوچانەدا کێشایەوە کە ژەنراڵ فۆمی کۆنترۆڵی کردبوو ،وەك ئاسانکاریەك بۆ پرۆگرامی پێکهاتنەوەی نیشتمانی ... لەئاکامی زنجیرەیەك ڕوداوی نێگەتیف دا کەپاش مۆرکردن لەسەر کۆنگرەی پێکهاتنەوەی نیشتمانی لەلاوس دا ڕویاندا،حکومەتی ڤێتنامی باکوورلە (ئازاری ساڵی١٩٦٣)دا بڕیاریدا پاشەکشە بە سەربازەکانی نەکات و بەردەوام بێت لەهاوکاری کردنی شیوعیەکان کە توانیبویان ناوچەی ئیستراتیژی (بلان جارز) کۆنترۆڵ بکەن ... لەئەنجامی ئەم ڕووداوانەدا چەندین پێکدادان ڕووی دا لەنێوان گروپە ناکۆکەکانی لاوس دا ... و (C.I.A) یش ژمارەیەکی گەورەی لە پیاوەکانی خۆی ناردەوە بۆ لاوس ،بەمەستی سەرلەنوێ دروست کردنەوەی جموجوڵی پروپاگەندەیی سەربازی ،بۆ قەڵاچۆکردنی شیوعیەت لەژێر سایەی بودجەیەکدا کە گەشتبویە (٧٠)ملیۆن دۆلار .هەروەها (C.I.A) پلانی پێشوتری خۆی گۆڕیبوو ،ئەم جارەیان لەبری هاوکاری کردنی ئەفسەرە ڕاست ڕەوەکان ،دەستی کرد بەچەکدارکردن و مەشق پێکردنی خێڵەکانی (میۆ)بۆ پاراستنی کەلێن و ئەو ڕۆخانەی لێیانەوە کردەوەکانی (C.I.A) بە وڵاتدا بڵاو دەبێتەوە.هەروەها لە سۆنگەی گواستنەوەی چەك و پێداویستیەکانەوە بەرەو لاوس (کۆمپانیای هێڵە ئەمریکیەکان) سەر بە (C.I.A) بەڵێنی دا هێڵێکی ئاسمانی هەمیشەیی دابین بکات بۆ ناوچەکانی

نفـوزی خێڵـەکانی (میـۆ)هـەروەها (کۆمپانیــای گواســتنەوەی هــەوایی مــەدەنی) (٥٠٠٠کارمـەند و ٦٥ فڕۆکـە)ی خسـتە خزمـەتی ئـەو مەبەسـتەوەو هـەندێك لــە پێداویستیەکانی گواستەوە بۆ لاوس ... لێرەدا ئاماژە کردن گرنگە بەو خاڵەی کەلەو ماوەیەدا پروپاگەندەی ئەوە دەکرا گوایە فڕۆکە ئەمریکیەکان هەستابن بە گواسـتنەوەی مادەی بێهۆشکەرو یاساغ کراو هەرچەندە ئەم پروپاگەندانە نەسـەلمێنران لـەلایـەن هیـچ داواکارێکەوە ..(C.I.A) بەم گوتەیە پاساوی دەهێنایـەوە (فڕۆکـەکانی کۆمپانیاکـان جارناجــارێك بەمەبەســتی پشــکنین و ســەیرکردنی بزوێنــەرەکان (المحركـــات)و چاککردنـەوەی بەشـە لەکارکـەوتووەکان چونەتـە هــەندێك فڕۆکەخانــەو بنکــەی دیکە،بەرلـەوەی دەست بکەن بەگەشتە دورودرێژەکانیان) .

جگە لـەو دوکۆمپانیایــە (C.I.A) کۆمپانیایـەکی دیکـەی ئـەمریکی بـەکارهێنا بـۆ بەشداری کردن لـە پرۆسەی گواستنەوەکاندا بەرەو لاوس،کۆمپانیاکە(کۆمپانیای هێڵــە ئاسیاییەکان)بوو کەبارەگای ســەرەکی لـەتایوانـە ئـەم کۆمپانیایـە (٦٠٠٠)کارمـەندی بەکارهێنا بۆ چاککردنەوەو دابین کردنی پارچە دەگمەنە پێویســتەکان بـۆ فڕۆکـەکانی (C.I.A) و سوپای ئەمریکا پێکەوە.هەروەها (کۆمپانیای تەکنیکی باسیفیك)بەشداری کرد لـە چاودێری کردنی ئەرکەکــەی (C.I.A) لـەڕووی هونەریـەوەو هاوکاریشـی کرد لەدروستکردنی فڕۆکەخانە لــەلاوس و ڤێتنـام دا .بـەهۆی هەڵمـەتی بەخشـین و یارمەتیە لۆجستی یەکانەوە ،(C.I.A) توانی هێزێکی گرنگی ســەربازی لەخێڵــەکانی (میۆ)دروست بکات و هێزەکەش بەکار بهێنێت لـەبەرگری کردن لـەناوەندەکانی ڕادار و مانۆڕە دەریایــەکانی خـۆی لـەلاوس دا .. هـەر لەمیانـەی ئـەم کردەوانـەوە توانـی زنجیرەیەك هێرشی هەوایی سەرکەوتوو بکاتە ســەر ناوچــەکانی نفـوزی (هۆشـی منـە)، بەچاو پۆشین لـەوەی سەرکەوتنەکانی (C.I.A) بەهۆی خێڵەکانی (میۆ)ەوە ،بوە هۆی لەنێو چوونی نیوەی پیاوەکانی ئەو هۆزانە ، بەپێی ئامارێك کەلەنێوەڕاستی حــەفتاکاندا

کرا ،ئەنجامی ئامارەکەش بوویە هۆی پەژموردەییەکی زۆر بۆ ئەوپیاوانەی نەکوژرابوون و لە ژیاندا مابوونەوە.

لەسەرەتای حەفتاکانەوە تەرازوی هێزەکان لە لاوسدا گۆڕا و،شیوعیەکان توانیان سەرکەوتنی گرنگ بەدەست بێنن بەسەر خێڵەکانی (میۆ)دا و،ئەم سەرکەوتنانەش هانی ئەمریکیەکانی دا پەلە بکەن لەپاشەکشەکرد لە و ولاتەدا ،ئەوەبوو سالی ۱۹۷۳ پاشەکشەیان کردو هۆزەکانی (میۆ)ش لەسەر لوتکەی چیاکان وەبێ پالپشت دابڕان لە هەر کۆمەکیەك.

سەبارەت بەو کۆمپانیایانەی کە شانبەشانی (C.I.A) گلابوون لەکردەوەی گواستنەوەی چەك و پێداویستی ترەوە بەرەولاوس ،سەرجەمیان فرۆشران بەهەندێك لەو دەولەمەندانەی کەلەنێو خودی (C.I.A) کار دەکەن ... ئەمەش پاریزێکی لای زۆرێك لەرۆژنامەنووسان و ئەو کەسانە هەلایساند کە چاودێری جموجولەکانی (C.I.A) دەکەن .. لەم ڕووەوە (والتر لیبمان)لەرۆژنامەی ((واشنطن)پۆست)دا دەنوسێت:(من ئامادەم بێژم ئێمە لە مەوقیعی بەرگری کردنی هەمیشەیی داین لەچەند ناوچەو ولاتێك کەبزافی گۆڕانکاری و یاخی بوون بەخۆیانەوە دەبینن ،بۆیە هەندێکمان پێداگرین لەسەر بەخشینی مالێکی زۆر بێشومار و قوربانی دانێکی زۆری گیانی لەپێناوی سەقامگیرکردنی حکومەتێکی دۆگما کە بەگۆڕانکاری قایل نابن ... دروست وەك ئەو ڕایەی خرۆشۆف دەچێتەوە کەپێی وابوو شیوعیەت تاکە چارەسەرە بۆ قوتاربوون لە هەندێ ڕژێمی چینایەتی و ڕەگەزپەرست لە جیهاندا ).. لەلایەکی ترەوە ،(C.I.A) لە کەمبۆدیا هیندی چینی ڕۆلێکی خراپی گێڕا لە ئالۆزکردنی پەیوەندیەکانی نێوان کۆشکی سپی و حاکمی ئەو ولاتە لەشەستەکاندا (نۆرودوم سیهانۆك)(C.I.A) لەوەلامی هەلوێستی بێ لایەنانەی (سیهانۆك)دا لەناکۆکیەکانی ئەمریکا و ڤێتنامدا دەستی کردە هێرشی ڕامیاری و ئیعلامی لەدژی ئەمیری کەمبۆدی و شانبەشانی مەشق پێکردن و پڕچەك کردنی گروپی (الخمیر الحمر)...

(C.I.A)بەپروپاگەندەی نالۆژیکی پاساوی ئەو کردەوانەی دەدا ،تیایدا ڕای دەگەیاند کەمیانە ڕەوی سیهانۆك یارمەتی شۆڕشگێڕانی ڤێتنام دەدات تاکو پەنا بەرنە بەر کەمبۆدیاو ڕابکەن لەدەست سوپای ئەمریکا و هێزەکانی ڤێتنامی باشوور،وەلێ ئەو پروپاگەندانە قەناعەتیان نەکرد بەزۆرێك لە چاودێران و ئاگایانی کاروباری هیندی چینی ..

سالّی ۱۹٦٥ (نیویۆرك تایمز)بەم تەرزە توانجی دا لەسەر ڕۆلّی (C.I.A) لە هندی چینیدا:(زۆرێك لە ڕابەرانی ئەو ولاّتە هەنلە هەلّوێستی تازەیاندا لە ڕیزی هاوکارانی ولاّتە یەکگرتوەکانەوە گواستویانەتەوە بۆ ڕیزی ڕەخنەگران لە ئەمریکا ،گەر لەوەش پتر نەلّێین.. لەنێو ئەو ڕابەرانەدا سیهانۆك دەبینرێت کەلە وتارەکانی ڕۆژانەی دا هەست دەکەین ملی ڕێگای گرتۆتە بەر بەرەو ڕیزی ئەوانەی پێشکەوتون لەدژانی (واشنطن)).

شیاوی باسە ئەمیری کەمبۆدیا هەستی بە مەترسی کردلە هەلّسوکەوتەکانی (C.I.A)لە دوای ڕیسوابیەکەی (یارمەتی بێسنور)کەئەو دەزگایە لەسالّی ۱۹٦٥دا پێشکەشی یاخیبوانی ئەندەنوسیای کردبوو،بەهۆیەوە یاخی بووان توانیان حکومەتە نیشتمانیەکەی (سوکارتو)بڕوخێنن و حکومەتێکی ڕاست ڕەوی توندڕەو بهێننە سەرکار کە پتر لە ٥٠٠هەزار شیوعی کوشت بەوەش جێ پێی دیکتاتۆرێکی وەك سۆهارتۆ ی قایم کرد...

لەئازاری (۱۹۷۰)دا ژمارەیەك لە ئەفسەرانی سوپای کەمبۆدی بەهاوکاری (خمیرالاحمر)توانیان دەست بگرن بەسەر دەستەلاّتدا و ئەمیر (سیهانۆك)لەکار بخەن ،بەلاّم نەیانتوانی بیکوژن ،بەپێی گوتەی یەکێك لەلیپرسراوانی پێشوی موخابەراتی دەریایی ئەمریکی (صمؤیل ثورنتون)... ثورنتون دەلّێت C.I.A پلانێکی نهێنی دارشتبوو بۆ ڕوخاندنی ڕژێمی کەمبۆدی و کوشتنی ئەمیر (سیهانۆك)،بەلاّم ئەم

لەکاتێکدا ئەفسەرەکانی بەڕابەرایەتی (لون نۆل)کودەتایان بەسەردا کرد لە هەندەران بوو...

بەهەرحاڵ پێویستە لێرەدا بڵێین :کودەتاکەی (لون نۆل) بارودۆخی وڵاتەکەی تێکدا و کەمبۆدیای پەلکێشکرد بۆ کێشە گەلێکی ئابووری و ڕامیاری مەترسی دار ،کۆتایەمینیان کودەتای دیکتاتۆر(بول بات)بوو لە ساڵی (١٩٧٥)دا... وەك توانج دانێك لەڕەوشی ڕووداوەکانی کەمبۆدیا (هنری کیسنجر)وەزیری ئەوکاتەی دەرەوەی ئەمریکا لەساڵی (١٩٧٧ز)دا دەڵێت:(وڵاتە یەکگرتوەکان بێ تاوانە لەو پلانەی لەدژی ئەمیر سیهانۆك داڕێژرا ،بەلایەنی کەمەوە بۆئەوەی زیاتر سنور بەندکار بم ،بەرپرسە گەورەکان لە (واشنطن)لەو پلان گێڕیە بێ تاوان و بێئاگان).

ئەمە ووتەی (کیسنجر)ە ،کەبەهیچ شێوەیەك باس لە لێپرسراوە گچکەکان ناکات ،یاخود بەرپرسی کردەوە نهێنی یەکان ،لیپرسراوە بچوکەکان ئاسایی لێدوان نادەن... کەواتە ڕووی ڕاستی لە کوێندەرە؟ پرسیارەکە بەبێ وەڵام دەمێنێتەوە ...

بەهەر حاڵ ڤێتنام یەکەم قوربانی کردەوە نهێنیەکانی (C.I.A) لە هیندی چینی دا....هێزەکانی ئەمریکا لەوێدا ڕاستەوخۆ تەدەخولیان کرد،لە نێوان ساڵانی (١٩٦١ - ١٩٦٤)داموخابەراتی ئەمریکا ئاستی کردەوەکانی خۆی بەرزکردەوە بەدرێژی سنورەکان لەتەك ڤێتنامی باکوردا و هەندێك جاریش لەنێو پانایی ماڵی شیوعیەکاندا لە (هانوی)..بەڵام زۆرینەی ئەو کردەوانە ئامانجە ئیستراتیژیەکانی خۆیان دەستگیر نەبوو ،واتە تیرۆر کردنی دەستەڵاتدارانی ڤێتنام وەك ڕێخۆشکردنێك بۆ لەرزاندنی پایەکانی دەستەڵاتی شیوعی لەو وڵاتەدا و پاشانیش کودەتا کردن بەسەریدا .. (C.I.A) چەندین جار هەوڵی داوە سەرانی شیوعی ئەو وڵاتە ژەهر خوارد بکات ،یان تیرۆریان بکات یاخود بیان ڕفێنێت.نمونە لەسەر ژەهر خوارکردن ،ئەو هەوڵە بوو لەگەڵ فەرماندەی پۆلیسی هانوی دا دایان بەژەهرێکی کوشندە کەلەنێو بتڵی

(براندی)دا دایان نابوو .. بەرەو ڕفاندنی سەرجەم ئەندامانی حکومەتی ڤێتنام لە کۆبوونەوە یەکیاندا لە پایتەخت ...

ئیدارەی ئەمریکا (C.I.A) بەرەو ڕووی چەندین پرۆسەی تاقیکردنەوە کردەوە ،لەسەر کارایی کردە سیخوڕیەکانی بەرلەوەی فەرمان دەربکات بۆ هێزە ئەمریکیەکان بۆ تەدەخولکردنی ڕاستەوخۆ لەکاروباری ڤێتنام دا لە ساڵی ١٩٦٥. هەرچەندە (C.I.A) لەتاقیکردنەوە کرداریەکانیدا شکستی هێنا ،بەلام لەتاقیکردنەوەیەکی زارەکیدا دەرچوو ،تیایدا ئاشکرای کردبوو دەست تێوەردانی سەربازی ئەمریکا لە ڤێتنام دووچاری نشوستی دەبێت.

شیاوی یاد هێنانەوەیە (C.I.A) بەرلەوەی سوپای ئەمریکا دەست وەرداتە جەنگی ڤێتنامەوە ،توانی بووی بەتەنها لە شاری (سایگۆن)دا (١٠٠٠)بەکرێگیراو بۆ خۆی ژێربار بخات ،لە ساڵی ١٩٦٨وە بەڕێوەبەری تۆڕی (C.I.A) لە سایگۆن (ولیەم کولبی) خودی خۆی سەرپەرشتی (پرۆگرامی مونیکس)ی مەعلوماتی کرد... کە تایبەت بوو بەکۆکردنەوەی زانیاری لە مەڕکادرە شیوعیەکان و لێکۆڵینەوە لەگەڵیاندا بۆ پەردە لادان لە ڕووی ناوەندەکانی کەل و پەل و شانە شیوعیەکان لە ولاتدا ،(کولبی )پێی وابووپرۆگرامەکەی توانای هەیە سەرکەوتنی زیاتر بەدەست بهێنێت لەڕووی سەربازیەوە ،لەو بەرنامانەی هێزە ئەمریکیەکان دایان ڕشت و بۆردومانی دێهات و ناوچە قەرەباڵغەکانی دانیشتوانیان هەرەمەکیانە پێکرد ،یاخود جەنگان لەتەك گەریلاکاندا ڕوبەڕوو.

هەروەها (کولبی) ڕای وابوو سەرکەوتن بەسەر شیوعیەکانی ڤێتنام دا پێویستی بەکاری هێمن و نهێنی هەیە ،وەك لەبەرنامەکەشی دا کە ناسرابوو بە(فونیکس) دا ڕەنگی دابوویەوە ،هەرچەندە هەندێك لەکارمەندانی (C.I.A) لە سایگۆن پێچەوانەی ڕاکەی کولبی یان هەبوو ،نەخاسمە (فرانك سناب)ی کۆنە بەرپرس لە سایگۆن دا ،ئەو پێی وابوو پرۆگرامی فونیکس دەست پێچکەیەکە بەدەستی (C.I.A) و موخابەراتی

ڤێتنامی باشــــورەوە بــۆ درێــژە دان بــەکردەوەکانی ئەشــکەنجەدان و ڕەش بگــیر لەدژیشیوعیەکان و لایـەنگر و خـزم و کـەس وکاریـان .. بــەگوێرەی گوتــەکانی (سناب)،هەمیشە بەکرێگیراوانی (C.I.A) لەکردەوەی ئەشکەنجەدانەکاندا ئامادەبوون گەر نەڵێین کوشتن کە پیاوەکانی موخابەراتی ڤێتنامی باشوور پێی هەڵدەستان ،وە بەپێی زانیاری و گووتەی تر ،فونیکس بوە هۆی گیــان لەدەسـت دانـی ٢٥هـەزار قوربـانی ،بەشـێك لـەو قوربانیانـە لــەژێر ئەشـکەنجەداندا گیانیـان لەدەســت داوە ،لــەدوای پاشەکشەی هێزەکانی ئەمریکا لە ڤێتنام لەساڵی ١٩٧٣ دا ،پیــاوانی (C.I.A) تـاکو ساڵی ١٩٧٥ درێژەیان دا بەچالاکیەکانیان ،تا ئەودەمەی هێزەکانی ســەر بـە (هۆشـی منـە)شـاری (سـایگۆن)یـان داگـیرکردو ناچاریـان کـردن لەسـەربان و دیوارەکــانی باڵوێزخانەی ئەمریکاوە بــە فڕۆکـەی (هلیکوبـتر)ی ئـەمریکی ئـەو ولاتـە جێبێڵـن و لەدوای خۆیانەوە مەلەفی بــەکرێگیراوە ڤێتنامیـەکان بـە جێبـهێڵن ... ئـەم ڕوداوەش نیشــانەیەکیتربوو لەناپاکیــەکانی (C.I.A) و دەســت بــەردانی لــە هاوکــارو بەکرێگیراوە نهێنی یەکانی لە جیهاندا .

## بەشی هەشتەم

# ﴿ سیاسەتی هاوسێ یەتی ﴾

هەریەکە لە یەکێتی سۆڤیەت و ئەمریکا پەیڕەوی سیاسەتی پەروەردەکار و فێرکاریان لەدەوڵەتە دراوسێکانیاندا پەیڕەوی کردوە وخۆیان کردۆتە پارێزگاری کار لە نفوزی ئایدۆلۆجی و ڕامیاری هاوسێکانیان ... لەڕیزی سۆڤیەتدا ئەم قوتابیانە دەبینرا :(پۆڵەندا،تیشیکۆسلۆفاکیا،هەنگاریا،بولگاریا،ڕۆمانیا،ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات)، پۆلەکەی لەمەڕ ئەمریکاش پێکهاتبوو لەسەرجەم دەوڵەتە لاتینیەکان بەبێ ڕیزپەڕ .

لەساڵی (١٩٥٦ز)دا سۆڤیەت هەوڵێکی هەنگاری سەرکووت کرد کەتیایدا حکومەتەکەی (ئیمروناگی)بەهاوکاری جەماوەری قین لەدڵ ،هەستا بە هەڵوەشاندنەوەی پۆلیسی نهێنی و گۆڕینی ڕەگەزە شیوعیەکانی حوکم بەڕەگەزی میانە ڕەوی دیموکراسی ... بە گەشتنی تانکەکانی سۆڤیەت بۆ (بودابستی)ی پایتەخت لە تشرینی دووەمی (١٩٥٦ز)دا،ڕادیۆو هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان کەوتنە گێڕانەوەی هەواڵەکە لەزاری ئەو پەنابەرانەوە کەڕایان کردبوویە نەمسا گوایە لەشکری سۆڤیەت قەتڵ و عام و ڕەشبگیریەکی بێ وێنەی دروستکردووە لەو وڵاتەدا ،یاخی بوانیش توانای بەرگەگرتنیی ئەو کردەوە دڕندانەیان نیەبۆیە ،دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان پشتگیری خۆیان ڕاگەیاند بۆ یاخی بووان و دەست تێوەردانەکەی سۆڤێتیشیان شەرمەزار و ڕیسواکرد،هەروەها (C.I.A)و دەزگای هەواڵگری ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بەڵێنیان دا بە دیموکراسی خوازەکانی هەنگاریا ،کەئەگەر بێت و بەردەوام بن لەبەرهەڵستی کردنی سۆڤیەت ئەوا هاوکاری سەربازیان دەکەن ،لەو لاوە یەکێتی سۆڤیەت ئاگادار بوو چ لەژێر بەرەی ڕۆژئاواو هەنگاریا دایە،بەتایبەت بەرپرسی

ئەوکاتەی (K.G.B) جەنراڵ (ئەلسکەندەر ئیڤانۆف)بەدڵ ڕەق و شارەزایی زۆری لە بواری سیخوڕیدا ناوبانگی دەرکردبوو .

ئەم ئەلکسەندەرە کوڕی یەکێك لە جوتیارە ڕوسەکانە،بۆیەکەم جار لەساڵی ١٩٣٩ دا لەگەڵ پۆلیسی نهێنی دا کاری‌کردوە ،وەك بەرپرسی (پرۆگرامی سەقامگیرکردنی دەستەڵاتی سۆڤیەت لەناوچەکانی بەلتیسکی سەر بەیەکێتی سۆڤیەت)دا ... پاشتر گوازرایەوە بۆ (ئۆکرانیا)،لەوێندەرێ (خرۆتشیف) ناسی و لەو کاتەشەوە بووە بەر پرسی (K.G.B) ... لەپاش گەشتنی تانکەکانی سۆڤیەت بە (بۆدابست)ی پایتەختی هەنگاریا و سەرکەوتنی لە کوژانەوەی ئاگری یاخی بوونەکە لەدژی کرملین ،خودی ئەلکسەندەر ئامادەی کۆبوونەوەیەك بوو لەتەك نوێنەرانی هێزە سۆڤیەتیەکان لە بۆدابست و ڕابەرانی یاخی بوونەکە،بەمەبەستی تاوتوێکردنی چۆنێتی گەڕانەوەی سوپای سۆڤیەت لە شەقامەکاندا و دووبارە درێژ بوونەوەی باڵی دەستەڵاتی حیزبی شیوعی هەنگاری بەسەر وڵاتدا ...

لەکاتێکدا گفتوگۆو دانوستانەکانیان لەسەر مێزی نانخواردنی ئێوارە بەردەوام بوو،،ئەلکسەندەر و هەندێك لەپیاوەکانی خۆیان کرد بەژوری چێشت خانەداو ،هەریەك لە (ئیمرو ناگی)سەرۆك وەزیرانی هەنگاریاو ،سەرکردەی نوێی سوپای هەنگاریا ژەنراڵ (پول مالیتر)یان دەستگیرکرد... لەپاشدا ژەنراڵ لەتەك ژمارەیەك لەیاخی بوان و جیاخوازە سیاسیەکانی تردا لەکەش و هەوایەکی نادیاردا لە سێدارە دران .

دەگوترێت گوایە نوێنەرەکەی سۆڤیەت لەو کۆبونەوەدا ژەنراڵ (میخائیل مالینی)بەتوندی نارەزای خۆی دەربڕیوە بەرانبەر ئەم کردەوەی (ئەلکسەندەر)و لای بەرپرسە باڵاکانی سۆڤیێتیش سکاڵای کردووە ،وەلێ هیچ ئەنجامێکی وەدەست نەهێناوە ... لەئاکامی ئەم دەست تێوەردانە یەکلایی کەرەوانەی سۆڤیەت لەهەنگاریا ،دەنگی زۆرێك لەوانە کپ بویەوە کەلەئامادە باشی و خۆسازکردندا بوون بۆیاخی بوونی

هاوشێوە لەئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا ،بەوەش دەنگی هیواو ئاواتی سەربەخۆیی و ئازادیان کزو بێ ورە بوو،لەدوای بۆتابست سەرەهاتە سەر (پراگ)ی پایتەختی تیشیکۆ سلۆفاکیا،ئەوەبوو لەئابی ١٩٦٨دا ،تانکەکانی سۆڤیەت حورمەتی شەقامەکانی پراگیان شکاند لەدوای حاڵەتێکی یاخی بوون ،کە ژەنراڵێکی شیوعی میانە ڕەو بەناوی (ئەلکسەندەر دوبتشیك)سەرۆکایەتی دەکرد لەپێناوی سەربەخۆبوونی ناوخۆیی لەسیاسەتەکانی (مۆسکۆ)،و دروست کردنی ئەوەی ناوی لێنراوە (کۆمەڵگای مرۆیی سۆسیالیزم).. بەواتایەکی تر ،ژەنراڵ دوبتشیك لەدوای ئەوەی دەستەڵاتی لە (ئەنتۆنی نوفوتنی)ناسراو بەستالینی تیشکی گرتە دەست هەوڵی دا خۆی قوتاربکات لە هەژموونی کرملین بەسەر سۆسیالیستی یەتی تیشکی و ڕەهەندە ئابوری و کۆمەڵایەتیەکانی دا لەگەڵ ئەوەشدا ،پارێزگاری بکات لە هاوپەیمانی هاوڕێیەتی لەنێوان هەردو وڵاتدا هاتۆتە گۆڕێ لەچوارچێوەی پەیمانی وارشۆدا ،لەهەردوو بواری سەربازی و دەرەکی دا ... وەلێ (K.G.B) بەسەرۆکایەتی (یۆری ئەندۆبوف)(ڕابەری پاشتری یەکێتی سۆڤیەت)دودڵی خۆی دەربڕی بەرانبەر ئەو حاڵەتی لاڕێ بوونە دیموکراسیەی تشیکۆسلۆفاکیاو سیاسەتە (وڵابونەوە)ی دوبتشیك بانگەشەی بۆ دەکات و ڕاستەو خۆش پیادەی کردووە ،بە هەڵگرتنی سانسۆری سەر دەزگاکانی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەڤانی لە وڵاتدا.

لەلای (K.G.B) ئەم گۆڕانکاریە مەترسی دارە ،ئازادی دەداتە دەزگاکانی ڕاگەیاندن تاکو ڕەخنە لە پۆلیس بگرن ... پۆلیسی ناوخۆیی و پەیوەندی داپلۆسێنەرەکەی بە (K.G.B) یەوە دیارە ئەو کاتە زامێکی جەماوەری و جیهانی دروست دەکات لەسیاسەتەکانی دراوسێتی (مۆسکۆ) دا ،وجموجوڵە باوکانەکانی سۆڤیەت لە بەرانبەر زارۆکانی دا لە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا سنور بەند دەکات.

بەلەبەر چاوگرتنی ئاکامەکانی ئەم ئاڵوگۆڕە دیموکراتیە ،زرێ پۆش و تانکەکانی سۆڤیەت لە ڕۆژی ١٩٦٨/٨/٢٠دا ،حورمەتی تشیکۆسلۆفاکیان شکاندو چونە نێو

شەقامەکانی (پراگ)ەوە،بەسەرکردایەتی (ئەندرۆبۆف)ئەم کابرایە بەر لە بەرپرسەکانی تری سۆڤیەت گەشتە پراگ و دەست بەجێ دەستی کردە شالاوێکی ڕەشبگیری وا کە سەرجەم کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی ئیدانەو ڕیسوایان کرد،تەنانەت وایکرد لەهەندێك گەورە کارمەندانی سۆڤیەت ڕەخنە لەسیاسەتەکانی سەرکردایەتیەکەیان بگرن و بگرە دەستیش لەکار بکێشنەوە ،بەمە ڕەدی (لادیسلاف بیتمان)جێگری بەڕێوەبەری بەشی (ئاراستەکردنی ئیعلامی) لە (K.G.B)دا.

وەلێ ئەو کردەوەی قوتابی تیشکی (جان بالاش)کردی ،ویژدانی جیهانی هەژاندو سۆزی ڕای گشتی نێو دەوڵەتی هێنایەوە بەلای گەلی تیشك و بزوتنەوە دیموکراسیەکەی دا.. ئەوەبوو ئەو خوێندکارە تیشکیە (جان بالاش)لە گۆڕەپانی (ونسیسلاوس)دا،بۆ پرۆستستۆکردنی داگیرکردنی تشیکۆسلۆفاکیا لەلایەن سوپای سۆڤیەتەوە ،ئاگری لە جەستەی خۆی بەرداو ،لەشی خۆی کردە سوتماك و گیانی لەدەست دا.

لە واشنطن،(C.I.A)کەوتە بەر شالاوی ڕەخنەو گازندە چونکە بە ئاشکرا شکستی هێنا لە پێشبینی کردنی داگیرکردنی تشیکۆسلۆفاکیا لەلایەن سۆڤیەتەوە، یاخود تەنانەت بەلایەنی کەمەوە لەچاودێری کردنی جموجوڵەکانی سوپای سۆڤێتی لەساتە وەختی داگیرکردنەکەدا ... سەرۆکی ئەمریکا (جونسون)هەواڵی داگیرکردنەکەی ڕاستەوخۆ لەزاری باڵوێزی سۆڤیەت لە (واشنطن)ەوە بیست ،لەکاتێکدا سەردانی کردبوو لەکۆشکی سپی دا.. بۆ زانیاریش ،ئەرکی سەرەکی (C.I.A) بریتی یە لەچاودێری کردنی جموجوڵەکانی سۆڤیەت لەئەورووپای ڕۆژهەڵات و ئاگادار کردنەوەی ئیدارەی ئەمریکا لێی .. بۆ ڕووبەڕووبونەوەی شەپۆلی ڕەخنەکان، (هلمز)ی بەرپرسی ئەوکاتەی (C.I.A) دەڵێت :(لەدووهەفتەی ڕابردوودا زۆر قەڵس بووم ،تیایاندا هیچ ڕاپۆرتێکم لەمەڕ جموجوڵی سۆڤیەت لەتشیکۆ سلۆفاکیا دا پێنەگەیوە ).،لەلایەکی دیکەوە بۆ دڵ دانەوەی خۆی دەڵێت :(لەگەڵ ئەوەشدا متمانەم هەیە

بەوەی (C.I.A) توانای هەبوو بەچاکترین و تەواوترین شێوە هەستێت بەراپەراندنی ئەرکەکانی ،ئەگەر ئامانجی سۆڤیەتیەکان ئەڵمانیای دیموکراتی بوایە لە بری تشیکۆسلۆفاکیا).

شیاوی یاد خستنەوەیە لەو راپۆرتەدا کەساڵی (١٩٧٦)دەرچوە دەربارەی چالاکیەکانی (C.I.A) هاتوە،سەرەرای ئەو ئامێرە تازانەی خراونەتە خزمەتی دەزگای موخابەراتی ئەمریکا وە ،کەچی ئەو موخابەراتە نەی توانیوە لەماوەی دووهەفتەی تەواوی بەر لەداگیرکرانی پراگ دا ،مۆڵگەو جێگەکانی سوپای سۆڤیەت دەست نیشان بکات... هەروەها راپۆرتەکە دەنوسێت ،(C.I.A) ئاگاداری نیازەکانی سۆڤیەت نەبووە ،بەهۆی سەرقاڵیەوە بە ئەرکی ترەوە.. چاودێران یەك دەنگن لەسەر ئەوەی (C.I.A) بەهۆی سەرقاڵیەوە بە سەرکوتکردنی شیوعیەت لە دەوڵەتە دراوسێکانی ئەمریکا دا،دوا کەوتووە لەپەی بردن بە نیازەکانی سۆڤیەت لە دژی تشیکۆسلۆفاکیا...

ئەوەتا لە دوای رووداوەکانی گواتیمالا (١٩٥٤)و گەشتنی کاسترۆ بە حوکم لە کوبادا (١٩٥٩)،ئیدارەی ئەمریکا بەرنامەیەکی چری دەست پێکرد بەمەبەستی چەکدارکردن و راهێنانی دامەزراوەکانی پۆلیس‌وسوپا لە دەوڵەتە لاتینیەکاندا بەمەبەستی قەلاچۆو بنەبرکردنی شوعیەت و بەراقە کردن لەبنەماکانی دیموکراسیەت لەو وڵاتانەدا.. وەلێ ئەزمونی جیاوازی نێوان مەقولەی دیموکراسیەت و ئەو کردەو داپلۆسێنەرانەی سەلماند کەئەو دەزگایانە بەهاوکاری (C.I.A) و (FBI- نوسینگەی موخابەراتی فیدراڵی)پێی هەڵدەستان...

ئەوەتا بە ئاشکرا (C.I.A) گلاوە لەتاوانی سەقامگیرکردنی حوکمی پێرە عەسکەریەکەی بەرازیل لە ساڵی ١٩٦٤دا ،ئەمە جگە لەسەرکەوتن بەسەر گەریلاکانی سەربە (تشی گیڤا)لە پۆلیڤیا(١٩٦٧)... ئەو شاڵاوە (ئیعلامی ،سەربازیە)ش کە دەکرایە سەر شۆرشگێرانی(توبا مارۆس)لە گوندەکانی ئۆرگوای

لەنێوان (١٩٦٨-١٩٧٣)دا لە ئەنجامدا بویە هۆی هاتنە سەرکاری پێرێکی سەربازی ڕاستڕەوی هاوپەیمانی ئەمریکاو سیاسەتەکانی لە ئەمریکای لاتینی دا.

سەبارەت بەدەست تێوەردانەکانی (C.I.A) لەکاروباری تشیلی و ڕوخاندنی رژێمی دیموکراسی تیایدا و گۆڕینی بەحوکمی دیکتاتۆرێکی سەربازی وەك (بینوشیە)... یەکێك بوولەگرنگترین دەست تێوەردانێك کەهەردو زلهێزەکە لەناوچەکانی نفوزی ڕامیاری - جوگرافیاندا پێی هەستابن .. بابزانین لەوێندەر چ ڕویدا؟

دوابەدوای گەشتنی کنیدی بەکۆشکی سپی لە سەرەتای شەستەکاندا ،ئیدارەی ئەمریکا بڕیاری دا بەهەر نرخێك بووە تۆڵە بکاتەوە لە شۆڕشەکەی کاسترۆ و بەرهەڵستی سۆڤیەتیش بکات لە ئەمریکای لاتینی دا بۆ ئەم مەبەستە تشیلی هەڵبژێررا کەلە ئەزمونێکی دیموکراسیدا دەژیا لەنێوان حیزبەکانیشدا لەو پەڕی چەپەوە بۆ ئەو پەڕی ڕاست ،لەو وڵاتەدا حیزبی شیوعی جەماوەرێکی باشی هەبوو، بەجۆرێك دەیتوانی ئەگەر هاوپەیمانێتی بکردایە لەتەك گروپەکانی تردا،بەشێوەیەکی دەستوری دەسەڵات بگرێتە دەست و کۆمەڵگە بگۆڕێت بەکۆمەڵگەیەکی سۆسیالیستیلەسەر تەرزی کۆمەڵگە مارکسی لینینی یەکان لە هەڵبژاردنە سەرۆکایەتی یەکانی ساڵی ١٩٦٤ی ئەو وڵاتەدا ،ئیدارەی ئەمریکا جامی هاوکاری کردن ویارمەتی دانی خۆی ڕۆکرد بەسەر دیموکراسی خوازی مەسیحی (ئیدوار دۆفرای)لەدژی مارکسیەتی میانە ڕەو(دکتۆر سلفادور اللیندی).

(C.I.A) ڕاسپێررا بە مسۆگەرکردنی هەڵبژاردنی فرای بەهۆی ئامرازە هەمیشە بەکارهاتووەکانی ئەم مەسەلە سیخوڕیانەوە ،واتە بەهۆی دۆلاری ئەمریکی و ڕاگەیاندنی بەبەرنامەوە ،بەو جۆرە (C.I.A) هەڵمەتی هەڵبژاردنی دیموکراسیخوازە گاورەکەی دەست پێکرد ،سەرەڕای ترسی زۆری کارتلە ئەمریکیەکان لەبەرنامە سیاسیە لیبراڵیەکەی (فرای)کەتاڕادەیەك هاوسۆز بوو لەگەڵ کرێکاراندا .. لەگەڵ

ئەوەشدا ئەویان پێ باشتربوو لەپیاوێکی مارکسی وەك (دکتۆر لیندی)،بۆیە بێ ئـەوەی خۆی هەست بکات پشتگیری هەڵمەتەکانی هەڵبژاردنیان کرد و سەرکەوتنیشـیان بـۆ مسۆگەرکرد لەساڵی (١٩٦٤)دا ...

سەرەڕای سەرکەوتنی فرای لە هەڵبژاردنەکاندا لایـەنگران و جـەماوەری (لیـندی) مارکسی پەیتا پەیتا لەزیادی دەدا ،لەئەنجامدا لە پاش ٦ساڵ بۆ پۆستی سـەرۆك کۆمـار هـەڵبژێردرا ، و سـەرکەوتنی بەدەسـت هێنـا لـەبەرانبـەر ڕکابەرەکـەیدا (جـۆرج ئەلیسەندری) ڕاست ڕەوی موحافیزکار ،کە ڕاستەو خۆ لەلایەن (C.I.A) و کۆمپانیا زەبەلاحەکانی ئەمریکا لە تشیلی یەوە پاڵپشت دەکرا.

هـەروەها هـەندێك لـە کۆمپانیـا ئەمریکیـەکان ترسـی خۆیـان دەربـڕی لەوحاڵەتـە چەپڕەویەی تشیلی پێدا گوزەر دەکات ،بۆیە بڕە پارەیـەکی زۆرو زەوەندیـان بەخشـیە (C.I.A) ،لەپێناوی پارێزگاری کردن لە سەربەستی ئابوری لـەو وڵاتـەدا بـەئامانجی پارێزگـاریکردن لەبەرژەوەندیـە بازرگانیـەکانیان... یـەکێك لـەو کۆمپانیایانـەی بـڕە پارەیەکی زۆریـان بەخشـی بـە (C.I.A) و هەڵـمەتی هەڵبژاردنـەکانی ئەلیسـەندری ،(کۆمپانیای پەیوەندیە جیهانیەکانی A.T.T)بوو ،کەلەلایەن (جـون مـاکون)ی کۆنـە بەڕێوەبەری (C.I.A) ەوە بەڕێوە دەبرا ... هەروەها (کۆمپانیـای بیبسـی کـۆلا)کـە (دۆناڵد کاندڵ)هاوڕێی سـەرۆك (ڕیتشـارد نیکسـۆن) خـاوەنی بـوو ...لەسـەردەمی نیکسـۆن دا،کۆمپانیا یادکراوەکان ،بڕینیو ملیۆن دۆلاری ئەمریکیان بەخشـیە ئیـدارەی ئەمریکا وەك یارمـەتی دانـی هەڵـمـەتی هەڵبژاردنـەکانی کـاندیدی ڕاسـتڕەو ... وەلێ (کۆشکی سپی) بەڵێندەرایەتیەکەی ڕەفزکرد و خسـتیە ئەسـتۆی (C.I.A) ەوە ،ئـەم بـەڕۆڵی خـۆی هەسـتابوو بەکۆکردنـەوەی بـڕی (٧٠٠هـەزاردۆلار)بـۆ ڕاپـەڕاندنی ئەرکەکـەی ،شـیاوی باسـە بەتەنـها کۆمپانیـای (A.T.T)بـڕی ٣٥٠هـەزار دۆلاری بەخشی بۆهەستان بەئەرکی سەرخستنی هەڵمەتە ئینتیخابیەکانی ئەلیسەندری،بـەجۆرێك ڕق و تورەیی باڵوێزی ئەمریکی لە تشیلی بزواند ،ئـەم هەرچـەندە خۆشـی لـەچارەی

مارکسیەکی وەك لیندی نەدەهات وەلێ پێی وابوو ڕێگەچارەی دیموکراسی بەتەنها تاوتوێ کردنی لەو وڵاتەدا تایبەتە بە خودی گەلی تشیلی یەوە نەك هیچ لایەنێکی تر ...(ئیدوارد کوری)باڵوێزی ئەمریکا لە تشیلی لەسەرەتاوە ناکۆك بوو لەتەك ڕای (هنری هکتشر)ی بەرپرسی (C.I.A) لە تشیلی دەربارەی زەرورەتی پاڵپشتی کردنی کاندیدی ڕاستڕەو بەشێوەیەکی ئاشکراو ڕاستەو خۆ،بەڵام لەم ڕایەی پاشگەز بوویەوە لەدوای سەرکەوتنی (لیندی)لە هەڵبژاردنەکاندا بەکۆی (٣٦,٣٪)لەبەرانبەر ڕکابەرە ڕاستڕەوەکەی (ئەلیسەندری)کە (٣٤,٩٪)ی دەنگەکانی بۆ خۆی مسۆگەرکرد ...

بەو جۆرە لەدوای هەڵبژاردنەکان بوویە سەرۆکی تشیلی ... لێرەدا پێویستە ئاماژە بدەین بەوەی کۆمپانیای (A.T.T)یەك مانگ بەرلە ژوانی هەڵبژاردنەکان (یەك ملیۆن)دۆلارو (ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا )(نیو ملیۆن دۆلار)یان بەخشیوە بە (C.I.A) بەمەبەستی سەرخستنی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردنی (ئەلیسەندری)جگە لەو بڕە پارانەی پێشتر لەو پێناوەدا بەخشیبوویان...

لەدوای سەرکەوتنی لیندی ،بەڕێوەبەری (C.I.A) فەرمانێکی لە سەرۆك نیکسۆنەوە پێ گەیشت ،تیایدا دەڵێت :(پێویستە تشیلی ڕزگار بکرێت ،تەنانەت ئەگەر ئەگەری سەرکەوتنیش لە (١٠٪)تێ نەپەڕێت ،چاوت لە خەرجیەکان نەبێت ،(١٠ ملیۆن دۆلارت)دەخەینە بەردەست بۆ تەجنید کردن و بەکار بردنی ئەوەی دەتەوێت ،لە موجازەفە مەترسە ،باڵوێزخانەی ئەمریکا مەگلێنە لە ئەرکەکەوە ،ترس و تۆقاندن بچێنە لە بازاڕی ئابوری تشیلی دا ،وابکەن کارتلەکان لە ترساندا هاواربکەن ... خۆت ئامادە بکە بۆ کارێك لەماوەی ٤٨ کاتژمێردا )...

دەربارەی ئەو فەرمانانە (هلمز)ی بەڕێوەبەری (C.I.A) لەو کاتەدا دەڵێت :(ئەو ڕۆژە وام هەست دەکرد گۆچانی مۆسیقی مایسترۆم هەڵگرتبێت ،و کۆشکی سپی پێی هەڵگرتم).

سەرۆك ( لیندی ) لە (ناوەڕاستدا) چاودێری ئەو فڕۆكانە دەكات كە لە كودەتاكەی (١١/٩/١٩٧٣) دا بەسەر ئاسمانی كۆشكی سەرۆكایەتی‌دا دەسوڕانەوە .. لیندی لەم كودەتایەدا كوژرا ، دوای چەند مانگێك لە هەوڵی بێ وچانی شكست خواردووی (c.i.a ) بۆ كەنار خستنی لیندی و ڕوخاندنی حكومەتەكەی تاكە چارەسەر كودەتا بوو ).

بەگەڕانەوە بۆ ماوە ٤٨ كاتژمێری تەرخانكراو بۆ (C.I.A) تاكو پلانێـك بگـێڕێت لە دژی سەرۆكی تـازە هـەڵبژێردراو ،دەبینـین سـەرانی ئـەو دەزگـا موخابـەراتی یـە ماوەكەیان زۆر بەكورت دەزانی ،بۆیە پێیان وابوو پێویسـتی بەكردەوەیـەكی سـەربازی دەبێت ..

لەم ڕوانگەیەوە پلانگێڕان گرنگی دانی خۆیان چڕكردەوە لەسەر قەناعەت پێكردنـی سـەرۆكی ئـەركانی چـەكداری لـە تشیلی ژەنـراڵ (رینیـە شـنایدر)تـاكو هەسـتێت بەكودەتایەكی سەربازی بەسەر لیندی داو بزوتنەوە جەماوەریەكەشی سەركوت بكات. (شنایدر) لەلای خۆیەوە ئەم داواكاریەی ئـەمریكای ڕەت كـردەوە چونكـە پێچەوانـە دەبوو لەگەڵ بیرو باوەڕی دیموكراسیەكانیدا ،بۆیە بڕیاری دا یارمـەتی سـەرۆك لینـدی بدات بۆ هەستان بەئەركەكەی .

هەڵوێستەکەی ژەنراڵ وایکرد لە پلان دانەران وەدوی یەکێك بگەڕێت کەقایل بێت بەداواکاریەکەی ئەمریکا ... ژەنراڵی خانەنشین کراو (رۆبەرت ڤیۆ)بەم داوایە رازی بوو، دەستی کردە کۆبوونەوە لەگەڵ ڕاوێژکاری سەربازی ئەمریکا لە تشیلی کۆلۆنێل (پول ویمارت)و کۆلۆنێلێك لە سوپای تشیلیدا بەناوی (کامیلیۆ فانزاوالا)بۆ دەست بەکار بوون لە دارشتنی پلانێك بۆ فڕاندنی ژەنراڵ (شنایدر)و قوتاربوون لێی ... دوای دوو هەوڵی شکست خواردوو توانیان ژەنراڵ بکوژن ،دیارە کوژرانەکەی بەمەبەست نەبوو ،بەڵکو لەکاتی هەوڵدانیان بۆ فڕاندنی لە (٢٣/١٠)دا زامداربوو ،لەئەنجامی زامداریەکەیدا گیانی لەدەست دا .

شیاوی ئاماژە پێدانە (C.I.A) بڕی (٥٠هەزار دۆلار)ی تەرخانکرد ،بۆ فڕاندنی سەرۆکی هێزە چەکدارەکان ژەنراڵ شنایدر و قوتاربوون لە هەڵوێستە دیموکراسیەکانی ،هەرچەندە ڕفاندنی شنایدر ڕیگرنەبوو لەبەردەم (لیند)ی‌دا لەدەست بەکاربوون لە پۆستی سەرۆکایەتی دا و مامەڵەی دەستوری و یاسایی کردن لەتەك سەرۆکی نوێی هێزە چەکدارەکاندا ژەنراڵ (کارلۆس براتس)، (C.I.A) لەلای خۆیەوە بەوەندە دەستی کۆتا نەکرد ،هەڵمەتێکی بەرفراوان و قەبەی ڕاگەیاندنی دەست پێکرد ،بەهۆی هەندێك لەو پەیامنێرانەوە کە داراییان پێ باشتر بوو لەشەرەفی پیشەی ڕۆژنامەگەری ، یەکێك لەوانە بەداخەوە ،پەیام نێری گۆڤاری (تایم)بوو لە (سنتاگۆن).

هەروەها (C.I.A) سێ ملیۆن و پێنج سەد هەزار دۆلاری لەنێوان سالآنی (١٩٧٠-١٩٧٣) بەخشیە ڕۆژنامەی (میدکۆریۆ)ی تشیلی، بەمەبەستی چڕکردنەوەی هەڵمەتە ئیعلامیەکان ،بڕە پارەیەکی دیکەشی دابووە (پارتی دیموکراتی مەسیحی)و (پارتی نیشتمانی ڕاستڕەو) بۆوەی هاوکاری بکەن لە کڕینی ئێستگەی رادیۆیی و چاپخانەی تایبەت ... چاودێران کۆی ئەو بڕە پارەیەی (C.I.A) لەو ماوەیەدا خەرجی کردووە بە ٨ ملیۆن دۆلار مەزەندە دەکەن .

لە کۆتایدا (C.I.A) ئەوەی چاندبووی دوریەوە ، یەکێك لە ژەنراڵە تشیلی یەکان بەناوی (ئۆگستۆ بینوشیە) توانی ڕۆژی (١١/٩/١٩٧٣)کودەتایەکی سەربازی بکـات بەسەر سەرۆك (لیندی)داو جڵەوی دەستەڵات بگرێتەمشـتێکی ئاسـنین .. ئـەو مشـتە ئاسنینە توانی هەزاران لاوی تشیلی و لایەنگرانی (لیندی)ئەشکەنجە بدات و بتاسێنێ.

سەرەڕای ئەوەی (C.I.A) دان نانێت بەوەدا کەڕاستەوخۆ ئامادەسـازی کردبێـت بۆ کودەتای سەربازی ، کەچی سەرجەم بەڵگەکان ئاماژە دەکەن بە ڕۆڵی سەرەکی ئەم دەزگایە بەلایەنی کەمـەوە بـەجۆرێکی ناڕاسـتەوخۆ لەنەخشەکێشـانیدا بۆئـەم کودەتـا سەربازیە سەرکەوتووە .. بەڵام تراژیدیاکەی لەمەڕ تشیلی بەگووتەی چاودێران بەتەنها تراژیدیای ئەشکەنجەدان و کوشـتن و گرتـن نـەبوو ،بـەڵکو تراژیدیایـەکی ڕامیـاری و مرۆیی بوو ،ڕاپۆرتی لیژنـەی (ڕۆکفلـر)ی ئـەمریکی تـەعبیری لێدەکـات لـەکاتێکدا هەستاوە بەلێکۆڵینەوە لە چالاکیـەکانی (C.I.A) و ئـەم ئـەنجام گیریـەی وەدەسـت هێناوە:(بەڕەهایی ڕژێمەکەی لیندی هیچ جۆرە مەترسیەکی دروست نەکردبوو لەسـەر وڵاتە یەکگرتووەکان ،بەهۆی نەبوونی هیـچ نیـاز یـاخود ئاماژەیـەك دەربـارەی بوونـی سەربازیانەی سۆڤیەت لە تشیلی دا ... لەلایەکی ترەوە ڕژێمەکەی لیندی لـە خۆیـدا نمونەیەکی مارکسی وانەبوو ،بتوانێت شۆڕشی کۆمۆنیزمی هەناردە بکات لـۆ دەوڵەتـە لاتینی یەکانی دیکە)...

لەلێکۆڵینەوەو بەدوادا چونێکی تردا کە لیژنەیەك بـۆ ئەنجومـەنی پـیرانی ئـەمریکای ئەنجامداوە ،دەرکەوتوە کە (C.I.A) بەرپرسیارە لە لاوازکردن و کۆتـایی هێنـان بـە حاڵەتی دەستوری لە تشیلی دا ... بەپشت بەستن بەو دوو ڕاپۆرتەو چەندین ڕاپۆرتـی ڕۆژنامەڤانی و دبلۆماسی تر ،هاوپەیمان و دژەکانی ئەمریکا پێکەوە ڕەخنەیان گـرت لـە ڕۆڵـی نێگـەتیڤی (C.I.A) و کـردەوە نهێنیـەکانی لـە تشـیلی دا، و ڕژێمەکـەی (بینشیە)شیان ئاگادار کردەوە لە خراپی زیاتر پەلکێشانیان لـە ئەشـکەنجەدان وقـەتڵ و عامکردنی لایەنگرانی لیندی.. هێندەی نـەبرد ئـەو ئاگـادار کردنـەوەو ڕەخنەگرتنانـە

چوون بەهەوادا لەکاتێکدا بینوشیە و لایەنگرانی بەتوندی خۆیان سەپاند بەسەر حوکم دا... و ڕژێمێکی عەسکەری سەپاند بەسەر وڵاتدا و هەموو جۆرە خۆپیشان دان و کۆبوونەوەیەکی سیاسیان لە وڵاتدا یاساغ کرد ... لە هەوڵێکدا بۆ قوتار بوون لە بینوشیە و حوکمە دیکتاتۆریەکەی (بزوتنەوەی چەپڕەوی شۆڕشگێڕی تشیلی) لە ساڵی (١٩٨٦)دا ،کردەوەیەکی تیرۆرکارانەیان لەدژی بینوشیە ئەنجام دا ،خەریك بوو لەنێو بچێت بە هۆیەوە ... جا ئایا شۆڕشگێڕان لە هەوڵی دووەمیاندا سەرکەوتن بەدەست دێنن و دەستەڵات دەگرنە دەست ،بەمەبەستی گۆڕینی بۆ ئەنجومەنێکی شۆڕشگێڕانە دژی وڵاتە یەکگرتوەکان و حیزبە ڕاستڕەوەکانی لە تشیلی دا؟

ئەمە ئەو پرسیارەیە کە لەناخی هەندێك لەچاودێرانی کاروباری تشیلی ستەم لێکراودا ئۆخژنی گرتووە ... لەناوچەیەکی تری جیهاندا ،کەزۆر دوورە لە ئەمریکای باشوورەوە ،کودەتایەك ڕووی دا لە ئەفغانستان دا کەدەکەوێتە نێوان پاکستان و یەکێتی سۆڤیەتەوە ... لە نیسانی ساڵی (١٩٧٨)دا دەستەڵات لەلایەن (نور محمد تەرەقی)چەپڕەوەوە گیرایە دەست ،ئەم هەر دەست بەجێ داوای کرد لە هەڤاڵە سۆڤیەتیەکانی تاکو یارمەتی بدەن لە گۆڕینی دەوڵەتە دواکەوتوەکەیدا بۆ دەوڵەتێکی سۆسیالیستی مۆدێرن.. وەلێ ئەم بازە خێرایە ،بوویە هۆی قەڵس بوونی هۆزە موسوڵمانەکانی چیاکانی ئەفغانستان و وای لێکردن بەتوندی لەدژی پێشکەوتنە سۆسیالیستەکەی وڵاتەکەیان بوەستنەوە.. هێشتر ساڵ و نیوێك تێنەپەڕیبوو بەسەر هاتنە سەرکاری تەرەقی دا کەبەدەستی سەرك وەزیرانەکە خۆی (حفیظ الله أمین)کوژرائەمیش لەئەنجامی دەست تێوەردانی سەربازیانەی سۆڤیەت لە ئەفغانستان لەمانگی (١٩٧٩/١٢)داکوژرا .. وەلێ کوژرانی (حفیظ الله)نەبووە هۆی باش بوونی بارو دۆخی مانەوەی سۆڤیەتیەکان لەسەر زەویەکانی ئەفغانستان ... بەڵکو بە پێچەوانەوە (C.I.A) باری فەوزەوی نێو وڵاتی قۆستەوە ،دەستی کردە بەخشینی یارمەتیەکی بێ سنوور بۆ هۆزە ئیسلامیەکان کەلە حوکمی سەرۆکی نوێ(بابراك کارمل)یاخی ببوون

... بۆزانیاریش،(K.G.B) هەرلەسەرەتاوە دەست خۆشی نەکردبوو لە بیرۆکەی داگیرکردنی ئەفغانستان ... کەچی جارێکی تر خۆی دیتبویەوە لە بەرانبەر بەرهەڵستی یەکی جدی و لێبڕاوانەی (C.I.A) دا کە (١٠٠ملیۆن)دۆلاری تەرخانکردبوو بۆ ڕاهێنان و چەکدارکردنی موجاهیدەکانی ئیسلام لە پاکستان و ناوچەکانی تردا..

سەبارەت بەو لایەنەش کە کارئاسانی کرد بۆ دزە پێکردنی چەك بۆ نێو ئەفغانستان ،ئاگایانی ئەم بوارە دەبێژن مصر یەکەم خۆبەخش بۆ هەستان بەم کارە بە هاوکاری لەگەڵ پاکستان دا .. ئینجا چین خۆی لەمەسەلەکە هەڵقورتاند و دەستی کرد بەگواستنەوەی چەك بۆ پاکستان لە هەمان پێناودا..

هەروەها یەکێك لەبازرگانەکانی کەنەدیەکان هەستاوە بەکڕینی ئەو چەك و جبەخانە سۆڤیەتیانەی کە ئیسرائیل لە سووری و فەلەستینی یەکانی گرتبوو، لەبازاڕی ڕۆژانەی پاکستاندا و چەکانەی دەفرۆشتەوە ،دیارە بازاڕەکە تایبەت کرابوو بۆ یارمەتی دانی شۆڕشگێڕانی ئەفغان .

سەرەڕای زۆری یارمەتیە فرە چاوگەکان ،شۆڕشگێڕان نەیان توانی سەرکەوتنی کۆتایی مسۆگەر بکەن بەسەر ڕژێمی سۆسیالیستی دا.. چەند جار هەوڵیان داوە کۆنگرێسی ئەمریکی قایل بکەن بە زەرورەتی زیادکردنی هاوکاریەکان بۆ شۆڕشەکەیان لەدژی دوژمنە سۆڤیەتی یکان و بەکرێگیراو وچاوساغە ئەفغانیەکانیان ، کەپارەیەکی زۆر و زەوەند وەردەگرن لەبەرانبەر دزینی زانیاری سەربازی لەسەر نیازەکانی شۆڕشگێڕان و مەڵبەندەکانی نیشتەجێ بوونیان بۆ سۆڤیەتیەکان.

دوای ساڵانێکی دوور و درێژی کوشت و کوشتاری ڕۆژانە لە ئەفغانستاندا،ڕابەری سۆڤیەتی (میخائیل گۆرباتشۆف)بڕیاری دا سوپاکەی لە ئەفغانستان بکێشێتەوە،لەیەکەم دانپێدانانیدا بە نسکۆی سیاسەتی (هاوەڵایەتی) لە دراوسێ یەتیدا.

لەگەڵ ئەوەشدا سۆڤیەتیەکان توانیان سەرکەوتنێکی سنوردار تۆماربکەن لە کاتێکدا توانیان بەهۆی ژەنراڵێکی پۆڵۆنی (وژیاك یاروزلسکی)یەوە سەرۆکی میانە ڕەوی

ولآت و حیزبی شیوعی (ئیدوارد ژیاریك)بگۆڕن و خودی ژەنـرالّ (یاروزلسـكی)لـە ڕابەرایـەتی ولآت بخـەن ژەنـرالّ (یاروزلسـكی)توانـــی ڕۆژی (١٣-١٢-١٩٨١)دا ،ڕابەری سەندیكای سەربەخۆی (هاوكاری) كرێكاران (لیش فالیسـا)و ژمارەیـەك لـە هاوەڵـەكانی دەسـتگیر بكـات ..(فالیسـا)و هـاوڕێ كرێكارەكـانی لـــە بـەندەری (گدانسك)توانیبوویان لـەو ماوەیەدا مەترسیەكی گەورە دروست بكەن لـەســەر ڕژێمی شیوعی پۆلۆنیا ی هاوپەیمانی سۆڤیەت چونكـە ژمـارەی ئـەو كرێكارانـەی پـەیوەندیان كردبوو بە (سـەندیكای هاوكـاری)یـەوە لـە هـاوینی (١٩٨١)دا گەیشـتە دوملیـۆن كرێكار ،لە نێویاندا نیو ملیـۆن كرێكـاری شـیوعی دەبیـنران بەڕابەرایـەتی (بوگـدان لیس)ی جێگری فالـسیا.

بەهەمان شێوەی (هەنگاریاو تشیكوسلۆفاكیا)پۆلۆنیا لـەسەرەتای شەستەكانەوە،كەوتە بەر ئەزمونێكی دیموكراسی كە شیوعی میانەڕەو (رادسیلۆ گومولكا)دەسـتی پێكردبـوو .ئـــەم ســـەرەڕای شكســـت هێنـــانی ڕاپەڕینەكـــەی كرێكـــارانی بـــەندەری (بوزنـان)لەسـالّی(١٩٥٦)داتوانیبـوی بگاتـە سـەرۆكایەتی حیزبیشیوعی ...ئەمـە سەرەڕای هەوڵو كۆششەكانی سۆڤیەت بـۆ خنكـاندنی هـەموو دەنگێكـی داواكـاری پەرەپێدانی ڕژێمی سۆسیالیستی لە پۆلۆنیادا.

پاش ماوەیەكی زۆر لە گوریس ڕاكێشان لەنێوان وارشۆ و (مۆسكۆ) دا،شـیوعیەكی میانەڕەوی دیكە بەناوی (ئیـدوارد جیـارك)هاتـە كایـەوە ،ئـەم چنگـالّی ڕژێمـی لـە قورقوراگـەی ئازادیـەكان داگـرت و ڕێگـەی دا بـەجۆرێك لـەوالآبوون و كرانـــەوە لەبواری ڕاگەیاندندا.لەو ماوەیەدا بۆنمونە ڕێگەدرا بەبەرهەمهێنەری سینەمایی (ئەندریـە وجدا) تاكو فلمێك دەربارەی سەندیكای هاوكاری و فالسیای ڕابەری بەرهەم بهێنێت و دابەشیشی بكات ،هەروەها شاكارەكانی هۆزانڤانی نەیاری پۆلۆنی (زیسلو میلوز)لە ئێستگەی ڕەسمی وارشۆ وەدەخوێندرایەوە. هەروەها وتارو لێكۆڵینـەوەی هـەندێك لـە بیریـارو ڕۆشنبیرەكانی دژ بەشیوعیەتیش بلآودەكرانـەوە بەنمونـەی لێكۆڵینـەوەكانی

(جاسیك كورون).هەموو ئەوانە بونە هۆی قەڵسی و پەستی (كرملین)و هانی ڕابەرانی دا،تاكو هاوكاری ژەنراڵ (یاروزلسكی)بكەن،تاكو كودەتا بەرپا بكات بەسەر شیوعیە میانە ڕەوەكانداو كۆنترۆڵی حوكم بكات .

وەلێ كردەوەكانی (یاروز لسكی)نەبونە هۆی سنوردانانێك بۆ مەرامی كرێكارە پۆلۆنیەكان لە بەڕێوەبردنی كاروباری سەندیكا سەربەخۆكەیان ،بەڵكو بەپێچەوانەوە ئەم جۆرە مەرامانە زیادی كرد ،بەتایبەت لە كەنیسەی كاسۆلیكی یەوە كە هەرگیز دژایەتی خۆی بۆ ڕژێمەكەی (یاروزلسكی)نەشاردۆتەوە نەخاسمە لەدوای ئەوەی پۆلیسی نهێنی پۆلۆنی هەستا بەكوشتنی قەشەی كاسۆلیكی (جوزی بوبیالوسكی)ی هاوپەیمان و برای ڕۆحی سەندیكای هاوكاری..ئەمانە دیارترین ڕووداوەكانی دەوڵەتە هاوسێكانی سۆڤیەت بوو لە حەفتاكان و سەرەتای هەشتاكاندا .. ئەوەش لەنێو دراوسێكانی ئەمریكا دا لەكۆن و نوێدا ڕوو دەدەن،هەوڵی بەردەوامی كۆشكی سپی یە بۆ تەمبێ كردنی ڕژێمە شۆڕشگێڕەكان لە ئەمریكای لاتینی دا(بۆنمونە :نیكاراگوا)لەگەڵ سەرەتای هەشتاكاندا... و بەرهەڵستی كردنی بزوتنەوە ڕزگاریخوازەكانی دیكە كە ڕەوتی چەپڕەوانەیان هەیە ،وەك سوپای شۆڕشگێڕ لە سلڤادۆر..

## بەشی نۆیەم

# ﴿ سیخوڕی کردن لە حەفتاکاندا ﴾

لــەماوەی حــەفتاکاندا هەریــەك لــە موخابــەراتی ئــەمریکاو سـۆڤیەت کەوتنــە نێــو بارودۆخێکەوە کە ترازوی هێزی لەنێوانیاندا گۆڕی و ڕەنگ دانەوەشی هەبوو بەســەر سیاسەتی هەردوو زلهێزەکەوە لەلای دراوسێکان و هەموو جیــهانیش دا ،لــە کـاتێکدا لێزمەی ڕەخنەی جــەماوەری و ڕامیـاری دەڕژا بەســەر (C.I.A) و کــردەوە کـانیدا لەناوچە داغەکانی جیــهاندا ،کرملــین ســەرقاڵی دوبـارە ڕێکخســتنەوەو ڕاهێنانــەوەی سوپاکەی (K.G.B) بوو بەســەرکردایەتی پیـاوی ئاسـنین (یـوری ئـەندرویوف)ئـەم لەوکاتەوە کەلەساڵی (١٩٦٧)دا سەرکردایەتی (K.G.B)گرتە دەست دەستی کــرد بەلادانی بزوتنەوە ریفۆرمیەکەی (خرۆتشیف)لەنێو (K.G.B)دا.. خروتشیف هەســتا بە گۆڕینی ڕەگەز شیوعیە پسپۆڕەکانی بواری سیخوڕی بە ڕەگەزی لاو بــێ ئـەزموون کە لە ڕێکخراوی (کۆمسمون=لاوانی شیوعی)ە وەهێنابوونی .

لەساڵی (١٩٥٨ز)ەوە (ئەلکسەندەر شلیبین)ڕابەرایەتی ئەو ڕەگەزە لاوانــەی گرتــە دەست ،لەدوای ئەمیش (فلادیمیر بفیمو ڤیتش) جێگەی گرتەوە .. لەسەردەمی ئەم دوو لاوەدا (K.G.B)چەندین خورپەیوای لێکــەوت کــە توانـا داری و جەبــەروتی ئــەو دەزگایەی لــەنێو خــۆو دەرەوەدا لــەرزاند .. ســاڵی ١٩٦٢ (ئۆلــگ بنکوفســکی)ی کۆلۆنیلی سەربازی لە مووخابەراتی سۆڤیەتی دا دەستگیر کرا بەهۆی تۆمــەتبارکردنی بەدزینی زانیاری بۆ موخابەراتی بەریتانی (M16)بۆماوەی دووساڵی تەواو..

ماوەیەکی تر تێپەڕی جیابوونــەوەو پــەرت بونێکــی ســیخوڕی تــر ڕویدا ســیخوڕی سۆڤیەتی لە فنلندا (ئــەناتۆلی گولیســتین)پێــی هەســتا و نــاوی چــەندین بــەکرێگیراوی

(K.G.B) لەرۆژئاوادا ئاشکرا کرد هەرلەهەمان ماوەدا (K.G.B) ناوبانگی خۆی لەنێو هاولاتیانی سۆڤیەت دا لەکەدار کرد بەهۆی ئەودادگایە تەمسیلیانەوە کە پێی هەڵدەستا وەك ڕێخۆشکردنێك بۆ حوکم دان بەسەر هەندێك نەیاری سیاسیدا بەنمونەی:(سینیا فیسکی)و (دانیاڵ).

هەموو ئەمانە بە دەستێکی سیحری سڕانەوە لەدوای ئەوەی (ئەندرۆ بوف)گەشتە سەرەوەی هەرەمی ڕێکخستن لە (K.G.B) ..ئەندرۆبۆف خاوەنی مێژویەکی دێرینە لەخەباتدا لەدژی نازیەکانی ئەڵمان لەماوەی جەنگی جیهانی دووەم دا لە سلکی دبلۆماسیشدا وەك بالیۆزی سۆڤیەت لە هەنگاریا لە ساڵی (١٩٥٦)دا کاری کردووە.. دەگوترێت (ئەندرۆ بۆف) دوای ئەوەی ڕۆڵێکی کاریگەرو گرنگی بینی لە هەنگاریا لەدوای ڕاپەڕینەکەی (١٩٥٦)کرایە سەرۆکی (K.G.B) .. ئەو ڕاپەڕینەی کە بووە هۆی داگیرکردنی (بۆدابست)لەلایەن سۆڤیەتەوەو دەستگیرکردنی ژەنراڵ (مالیتر)ی هەنگاری دوای ڕابەرایەتی (K.G.B) گرتنە دەست لەلایەن (ئەندرۆ بۆف)ەوە،دەستی کردە هەڵمەتێکی ڕێکخستن و پاکژکردنەوەی توندوتیژ، بارودۆخی کاری کارمەندان و بەکرێگیراوانی چاککرد ،سەرەتا لەپێدانی جۆرەبەرگێکی باشترە وە بگرە تاکو فێرکردنی زمانە بیانیەکان ..هەروەها هەستا بەدانانی چەندین پسپۆری بواری موخابەرات بۆ کارکردن لەتەك شانە دبلۆماسیەکانی سۆڤیەتدا لە هەندەران زۆرێك لەکارمەندانی موخابەراتی گۆڕی جگە لەوانەش قەدەغەی کرد لەهەندێك ئەندامی تر کە لەیەك کاتدا کاری موخابەراتیش بکەن و ئیدمانیشیان هەبێت لەسەر مەی نۆشین ..(ئەرکادی شڤتشنکۆ)گەورە کارمەندی (K.G.B) دەربارەی دەست نیشانکردنی (ئەندرۆ بوف)بۆ ئەو پۆتە دەڵێت:(لەکۆتایدا بوینە خاوەنی ڕابەرێکی بەهێز لە(K.G.B)دا کەپشتی پێ دەبەستین).

لێرەدا پێویستە ئاماژە بدەین بەوەی (K.G.B) دەزگایەکی زەبەلاحەو بەپێی خەملاندنی هەندێك لەئاگایان کارمەندانی پێك هاتوون لە :(٩٠)هەزار ئەندام

،(۳۰۰)هەزار پاسەوانی سنور و (۱۰۰) هەزار کارمەند لە نوسینگەو بینایەکانی (K.G.B) دا ..ئەمە جگە لەژمارەیەکی ئەندامی تر بەناوی (هێزەتایبەتەکان)ەوە .

بارەگای سەرەکی (K.G.B) کە ناسراوە بەسەنتەر لە گۆڕەپانی (دجیرجینسکی)نزیك کرملین دایە لەنێوەڕاستی (مۆسکۆ)ی پایتەختی سۆڤیەت دا. بەشی ۱٦ ی ئەم بارەگایە لەسەر پاشماوەکانی زیندانی (لوبیانکا)ی بەناوبانگ دروست کراوە .. سەبارەت بەپرۆسەکانی بەکاربردن و دامەزراندن، داواکاریەکانی کارکردن شەکلی بوون و دامەزراندنیش بەزۆری لەڕێگەی ناسراوو هاوەڵانی ناو (K.G.B) ەوە دەبوو ... سەبارەت بەچۆنێتی دابەشکردنی ئەرك و فەرمانەکان لە (K.G.B) دا مەسەلەکە ڕوون و ئاشکرایە ،لە کۆی چوار بەڕێوەبەرایەتی سیانیان تەرخانکرابوو بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارە ناوخۆییەکانی وڵات، ئەمەش یانی سیخوڕی کردن بەسەر نەیارە سیاسیەکان و ئەوانەشەوە کە گومانیان لێدەکرێت .. و هەوڵدان بۆ بەکاربردنی زۆرترین ژمارەی ئەو ڕۆژنامە نوس و دبلۆماسانەی کە لەیەکێتی سۆڤیەتدا کاردەکەن .. ئەوانە هەموو لەلایەك ،بەڕێوەبەرایەتی دووەمی (K.G.B) ئەرکی ئەوەبوو کچە جوان و شۆخ و شەنگەکان ژیربار بکات ،بەمەبەستی لە خشتە بردنی دبلۆماسیە بیانیەکان وسیخوری کردن بەسەر کارەکانیانەوە ... ئەندرۆ بۆف گرنگی داوە بەم بوارەو لەسەرەتای دەست بەکاربوونیەوە هەولّی داوە زۆرترین کچی جوان بێنێتە ڕیزەکانی (K.G.B) ەوە ،بە هەرچی ئامرازێك کە دەلوێت..

بەهۆی ئەم ڕێگەیەوە بۆنمونە ،(گالیا)ی شۆخ و شەنگی سۆڤێتی وکارەکەری باڵوێزی بەریتانیا لە (مۆسکۆ) (جفری هارسیۆن)توانی باڵیۆز لەخشتە بەرێت و پەیوەندی سکسی لە گەڵ دا ببەستێت... بەڵام پاش ماوەیەکی کەم باڵیۆز مەسەلەکەی ئاشکراکردو لەلای بەرپرسە باڵاکەیدا لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا دا دانی نا بە هەڵەکەیدا، بەرپرسە باڵاکەش ناچار بوو (هارسیۆن)بگۆڕێت بە باڵیۆزێکی تر بەناوی

(دنيكا ولسون).. ئەم شەش هەفتە دواى ئەوەى گەيشتە (مۆسكۆ) (گاليا)ى لەبالێۆزخانەى بەريتانيا دەركرد،هۆكارى ئەم كردەوەيەشى ڕانەگەياند.

(ولسون)بالێۆزى ئوستراليای لە (مۆسكۆ) ئاگادار كردەوە لەبەكاربردنى (گاليا) لە بالێۆز خانەكەيد ،لەوەلامى پرسيارێكدا كە بالێۆزەكەى ئوستراليا لێى كردبوو ،دەربارەى ڕاى ئەو بەرانبەر كارەكەرە پێشوەكەى ..

سالى (١٩٦٩)،ئەندرۆبوف بەڕێوەبەرايەتى پێنجەمى لە (K.G.B) دا دامەزراند و ئەركى مامەلە كردن لەگەل نەيارە سياسيەكان و بنەبڕكردنى چالاكيەكانى لەولاتدا خستە ئەستۆ .. لەيەكەم ساتەكانى دامەزراندنيەوە ئەم بەڕێوەبەرايەتيە پرۆگرامێكى زيرەكى گرتە بەر بۆ قوتاربوون لەنفوزى هەندێك نەيارى سياسى لەسەر گەلى سۆڤيەت .. لەنێو سەردێڕ و بابەتەكانى ئەم پرۆگرامەدا بۆنمونە، توندو تۆلكردنى چاودێرى و قەلس كردن لەدژى نەيارەكان و فشارى دەرونى خستنە سەريان تاكو ناچاربن هەلبێن بەرەو ڕۆژئاواو لەوێ داواى مافى پەنابەرى ڕاميارى بكەن ،دەبينرا .. ياخود هەلبەستنى چيرۆكى وەها كەيارمەتى (K.G.B) بدات ،بەوەى بتوانێت ئەو نەيارە سياسيانە تۆمەتبار بكات بەشێت بوون ،وەك ڕێخۆشكردنێك بۆ ناردنيان بۆچارەسازى عەقلى لەبرى بەئاشكرا دادگايى كردنيان لە ولاتدا... چاودێران پێيان وايە بەرنامەكەى ئەندرۆبوف بەرهەمى باشى هەبوو،ئەوەتا لەسەرەتاى هەشتاكانەوە ڕۆلى نەيارە سياسيەكان لە يەكێتى سۆڤيەتدا لەكەمى دەداو جموجولە جەماوەريەكانيشيان بەتەواوى بەرەو لاوازى دەچوو.

سەبارەت بەئەرك و فەرمانەكانى بەڕێوەبەرايەتى سێيەم كەهەندێك جار بە بەڕێوەبەرايەتى پاسەوانى سنوور دێتە ناوزەدكردن ،ئەندرۆبوف شێوازەكانى سيخوڕى كردنى ئەم دەزگايەى چەكوش كارى كرد ...و پەيوەنديەكانيشى لەگەل سوپاى سۆڤێتيدا باشكرد ،چونكە سوپاى سۆڤيەت بەردەوام ناڕەزايى دەردەبڕى بەرانبەر خۆ هەلقورتاندنى ئەم بەڕێوەبەرێتى يە لەكاروبارەكانى سەربازيدا.

وەك زانراوە لەسەردەمی ستالینەوە تاکو ئەوکاتەی (ئەندرۆبوف) سەرۆکایەتی (K.G.B) گرتۆتە دەست ،پەیوەندیەکانی نێوان هێزە چەکدارەکانو موخابەراتی سۆڤیەت لەسەر سنورەکانی ئەوروپای ڕۆژهەلات و ئاسیاو ناوچەکانی تردا ،پەیوەندی دژبۆدژ بووە ،ئەمیش بەهۆی سروشتی ئەرکەکانی موخابەراتی پاسەوانی سنور و ڕۆلّیان لەپلان دانان بۆ دەست تێوەدانە سەربازیەکان وەك لە (هەنگاریاو تشیکوسلوفاکیا)دا ڕوی‌دا..ئەم ڕۆلّیەی کەدرابووە (K.G.B) شانبەشانی ڕۆلّی بنەبڕکردنی نەیارە ڕامیاریەکان لە ولآتدا ،هەمیشە (K.G.B) جیاکردۆتەوە لە (C.I.A) ی ئەمریکی . هەرچەندە هەندێك پێیان وایە (C.I.A) لەنێو خۆی ئەمریکاشدا لەسەر ئاستی سیاسەتی ناوخۆیی ڕۆلّ دەبینێت.

لێرەدا ئاماژە دەکەین بەوەی (فیتالّی فدروشیك)ی جێگری (ئەندرۆبۆف) لە (K.G.B) دا،هەرکە گەشتە لوتکەی دەستەلآت لەو دەزگا موخابەراتیەدا ،هەولّی دا وێنەی موخابەراتی سۆڤیەت لەنێوخۆی سۆڤیەتدا جوان بکات ،بۆ مەیسەرکردنی ئەم ئامانجە ،داوای لەهەموو ئەندام و ئەفسەرانی (K.G.B) کرد ،تالەکاتی هەستان بەجێبەجێ کردنی ئەرکەکانی ڕۆژانەیاندا ،بەجل وبەرگی سەربازی ئاساییەوە دەربکەون،لەبری خۆشاردنەوە لەپشتی دەمامکەکەی پۆلیسی نهێنی یەوە .. هەروەها کاری‌کرد بۆ بەرهەمهێنانی فیلمی سینەمایی و تەلەفزیۆنی کەتیایدا پیاوانی (K.G.B) بە پالّەوانی ڕۆمانسی و بەهێز وێنا دەکات،کت ومت وەك فیلمەکانی (جیمس بۆند)...

سەبارەت بەئەرکەکانی بەڕێوەبەرایەتی یەکەم لە (K.G.B) دا یاخود بەڕێوەبەرایەتی سیخوڕی دەرەکی ،بریتیە لەکۆکردنەوەی زانیاری نهێنی و شیکردنەوەیان ودزەکردنە نێو دەزگا موخابەراتیەکانی دوژمن و دەزگا حکومیەکانیشیان،یارمەتی دانی بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکان ،و پارتە چەپەکان لەدنیادا ،دامەزراندنی پەیوەندی تایبەتی لەگەلّ دەزگاکان و پۆلیسی دەولّەتە ئەوروپیە دۆستەکان و کوبا دا ،هەروەها ئەم

بەڕێوەبەرایەتیە بەشی یانزەیەمینی پەیکەری ڕێکخستنی خۆی تەرخانکردووە بۆ ئەم جۆرە پەیوەندیە تایبەتانە لەگەڵ دەزگا دۆستەکانداو کارکردن بۆ سازکردن و مەشق پێکردنیان ،بەجۆرێك لەدوایدا (K.G.B) بتوانێت لەبەرژەوەندی خۆی بەکاریان بێنێت .

بەچاوپۆشین لەوەی بوونی هەندێك لەئەندامانی (K.G.B) لەهەندەران بەناشەرعی دێتە هەژماردن،وەك باروودۆخی یاسایی مانەوەی (جۆرج لونسدال)لەبەریتانیا ،و (رودولف ئابڵ)لەئەمریکا،یاخود بونێکی دووجەمسەرە وەك مانەوەی (کیم فیلبی)لە (واشنطن).. ئەوانەی تر لەئەندامانی (K.G.B) لەهەنددان وەك ئەندامی شاندە دبلۆماسیەکانی سۆڤیەت یاخود کارمەندی (ئەیرفلوت=هێڵە ئاسمانیەکانی سۆڤیەت)یان.... هتد، کاردەکەن بێگومان ئەندامانی (C.I.A)و(M16)ش لە ژێر ئەو دەمامکانەدا لە هەندەران هەن بەڵام بەژمارەیەکی کەمتر و لەنێو کەش و هەوایەکی جیاوازیش دا... بەگوێرەی گوتەکانی یەکێك لەکارمەندانی ئاسایشی فەڕەنسا:(توانیومانە لەنێو هەزار کارمەندی سۆڤێەتی و ئەوروپای ڕۆژهەلاتدا لەساڵی (١٩٧١)دا، ئاماری ٦٠٠بەکرێگیراوی (K.G.B) بکەین ،بێگومان ئامارکردنیشیان ئەرکێکی گرانە،گەر نەڵێین ئەستەمە)..

بەپێی ئەم ڕوانگە ڕۆژئاواییە بۆچالاکیە دبلۆماسیەکانی سۆڤیەت لەهەندەران دا،ئاساییە هەندێك دەوڵەتی ڕۆژئاوایی هەستن بە دەرکردنی سەرجەم ئەندامانی گروپە دبلۆماسیەکانی سۆڤیەت لە وڵاتی خۆیاندا...لەم ڕووەوە نمونەیەك دێنینەوە لەساڵی ١٩٧١دا سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا (ئیدوارد هیث)رای گەیاند : (٩٠)دبلۆماسی سۆڤیەتی لە بەریتانیا کاردەکەن وەك بەکرێگیراوی (K.G.B) ،بەمەبەستی ڕاپەڕاندنی ئەرکێك کەدەربارەی گوتی :(ئەرکێکی تێك دەرانەیە بۆ نەهێشتنی ڕژێم لەپادشا نشینی یەکگرتوی بەریتانیادا)لەبەر ئەوەهیث گوتی:(ئەو نەوەد دبلۆماسیە سۆڤیەتیە پێویستە دەست بەجێ وڵات جێ بێڵن و بەپانزە هاوەڵی تریشیان ڕابگەیەنن کە ئێستا لە

دەرەوەی بەریتانیان ،ئەوانیش لـەڕیزی دەرکراوەکـاندان و بۆیـان نیـە بگەڕێنـەوە بـۆ بەریتانیا ).

بەریتانیا لەدوای جیابوونـەوەی (ئولـگ لیـالین)لـە موخابـەراتی سـۆڤیەت بڕیـاری دەرکردنی ئەو دبلۆماسیانەی دا،(لیـالین)پـەردەی لادا لـەڕووی تۆڕێکـی سـیخوڕی سۆڤیەت لە بەریتانیا،کەکاردەکەن بۆ تێك دانـی دامەزراوەکانیتەلـەفۆن و بـێ تـەل و تۆڕی ئاو و ئاوەڕۆکان لە (لەندەن)...

هـەروەها (لیـالین)دانـی نابـەوەدا کـە (K.G.B) ئـەم و چـەند کـادرێکی تـری ڕاسـپاردووە تاهەسـتن بـەتێکدانی وێسـتگەی ئاگادارکردنـەوەی پێشـوەختی (فیلنگدالْ)لەباکوری یورك شایر...دواتر بەلْگەکان ئاماژەیان دەکرد بـەو ڕاستیانەی کە(لیـالین)زیـاد ڕەوی کـردووە لەتۆمـەتبارکردنی (K.G.B) و هـەروەها ڕونیـش بویەوەئـەو تـۆڕە ١٠٥ کەسـیەی نـاوی بـراوە ،زیـادە ڕەوی کـراوە لـەپێدانی ڕۆڵـی تێکدەرانە پێیان و ژمارەی ئەندامە کاراکانی لەسەر ئاستی کاری سیخوڕی ...

لەلایەکی ترەوە ،سەرچاوەکانی ئیستیخباراتی ڕۆژئاوا لەسـالْی ١٩٧٦دا ئاماژەیـان دەدا بـەوەی کـە (٣٦٪)لـەکۆی سـەرجەم دبلۆماسـیەکانی سـۆڤیەت لــەڕۆژئاوادا سەربەموخابەراتیسۆڤیەت بوون .. هەندێکی تر لەسەرچاوەکان پێیان وایە سـەرکەوتنی (K.G.B) لەبواری سیخوڕی دەرەکیدا دەگەڕێتەوە بۆ بڕوای ئەو دەزگایە (نەخاسـمـە بەڕێوەبەرایـەتی یەکـەم تیـایدا)بەبـەکارهێنانی ڕۆژنامەگـەری و ڕۆژنامـە نوسـان لەئاوەژوکردنەوەو لەکەدارکردنی چەند زانیاریەکیدیاریکراو،بەئامانجی لادانی سـەرنج لەسەر چەند زانیاریەکی تر کە سۆڤیەتیەکان بەگرنگی دەزانن لەوڕووەوە دەگوترێت کە (جوزیف فرولیك)ی جیابوەوەی تیشکی لەکاتێکدا پـەردەی لادا لـەڕووی پـەوەندی هەندێك لەپەرلـەمانتارە بەریتانیەکان بـە (K.G.B) یـەوە ،مەبەسـت لـێی تیوەگلانـی (M15)بوو لە تۆمەتینادیارەوە تاکو لانەکاتەوە بەلای چەندین بواری سیخوڕی تـردا کەزۆر گرنگ و زیندەیی (حیوی)ترن،هەروەها ڕۆڵی هەریەك لە (فیتـالْی بفتجنفیتـش

لوی)که له ڕۆژئاوادا به (فکتۆر لویس)ناسراوەو له (هەواڵەکانی ئێوارەی لەندەن)دا کاری دەکرد له پەنجاکاندا ،و (فلادیمێر گریگۆروفتیش)که خۆی کردبووە پەیامنێری ڕۆژنامەی (پرافدا)له (فلیپین)له ساڵی (١٩٧٤)دا،هەمان ڕۆڵ بووه..

له وڵاتی هندستان دا مەسەلەکە بەڕوونتر دەردەکەوێت ،چونکه هەندێك پێیان وایه بونی حەوت پەیامنێری (پرافدا)لەهندستاندا لەبەرانبەر تەنها دوو پەیامنێری (ڕۆیتەر)دا ،مانای وایە بەشێك لەو حەوت کەسە لەبەرژەوەندی (K.G.B) کار دەکەن ،لەلایەکی ترەوە تاهەنوکەش مەسەلەی تێوەگلانی بەڕێوەبەرایەتی یەکەم لە (K.G.B) دا ،له ڕاهێنان و پر چەککردنی ڕێکخراوە شۆڕشگێڕەکاندا ،یان وەك هەندێك دەڵێن ڕێکخراوە (تیرۆیستەکان)،مەسەلەیەکی خیلافیە لە مەحفەلە نێودەوڵەتیەکاندا ...هەرچۆن بێت بەڕاستی (K.G.B) دەستی هەبووە لە مەشق پێکردن و پرچەککردنی بزافەکانی ڕزگاری نیشتمانی.. بەنمونەی (ڕێکخراوی ڕزگاری خوازی فەلەستین)کەڕاستەو خۆ کۆمەك و یارمەتی لە (K.G.B) وەردەگرت، یاخوود وەك ڕێکخراوە شۆڕشگێڕەکان لە ئەمریکای لاتینی دا، کەلەسەر دەستی موخابەراتی (کوبا) ی دۆستی (K.G.B) دا ڕادەهێنرێن و پرچەك دەکرێن.

لەکاتێکدا (مۆسکۆ) بوونی هەرپەیوەندیەکی خۆی بەپرچەککردنی ڕێکخراوە تیرۆریستیەکانەوە بەدرۆ دەخاتەوە،زۆرێك لە دەوڵەتە نەیارەکانی بەگومانن لە هەڵوێستی (مۆسکۆ) بەرانبەر تیرۆری نێودەوڵەتی ... هەندێك لەو دەوڵەتانەی زۆر توند ڕەون له دژایەتی کۆمۆنیزم دا پێیان وایه یەکێتی سۆڤیەت خولگەیەکە،که تیرۆری نێو دەوڵەتی بەدەوریدا دەخولێتەوە ،ئەو تیرۆرەی که خۆی له سوپای نهێنی ئیرلەندەو ،شۆڕشگێڕانی (ساندینیستا)ی نیکاراگوا و .... هتد.دا دەبینێتەوە.. لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستیەکه هێشتر تەم و مژاویه ،چونکە ئەوەی هەندێك بەتیرۆری لە قەڵەم دەدەن هەندێکی تر بەخەباتی چەکداری لە قەڵەم دەدەن لەپێناوی ئازادی و سەربەخۆیدا سەبارەت بەڕێکخراوی ڕزگاری خوازی فەلەستین ،یەکێتی سۆڤیەت بەئاشکرا

(چەند گەریلایەکی سوپای نهێنی ئیرلەندی لە هەندێ دیمەنی دەگمەندا .. سەرەڕای هاوکاری کردنی کێشەی ئیرلەندا لەلایەن دەوڵەتە ڕۆژهەڵاتییەکانەوە ، کەچی ئەمریکا یەکەمین سەرچاوەی یارمەتی دانی سوپای نهێنی ئیرلەندە بووە و پێویستە ئاماژە بەو هەوڵە زۆرانە بدەین کە حکومەتەکانی ئەمریکا داویانە بۆ بەرگرتن لە هاوڵاتیانی ئەمریکا بەوەی باربووی سوپای نهێنی ئیرلەندە بکەن).

کۆمەکی دەکات بەوپێیەی بزافێکی ڕزگاری نیشتمانیە ،ئەمە لەکاتێکدا هەریەکە لەئەمریکاو ئیسرائیل ئەو ڕێکخراوە بە ڕێکخراوێکی تیرۆریست ناوزەد دەکەن.. ڕێکخراوەکە هەڵوێستی دەربارەی ئەم مەسەلەیە ڕوون و ئاشکرایە و ڕای دەگەیەنێت کۆمەکیە سەربازیەکانی سۆڤیەت سەرجەمی دەخزێتە خزمەتی شۆڕشی چەکداری فەلەستینەوە لەدژی ئیسرائیل ولەمەسەلەی تردا بەکار ناهێنرێت ،وەك شوێن بزرکردنی فڕۆکە مەدەنیەکان و چاندنی تەقەمەنی لە فڕگە جیهانیەکاندا وەك هەندێك گومان دەبەن .. سەبارەت بەسوپای نهێنی ئیرلەندەش ،بەپێی هەندێك لێکدانەوە ،کۆمەکیەکانی سۆڤیەتی لەڕێگەی موخابەراتی (تیشکیەوە پێ دەگات ... لەگەڵ ئەوەشدا تۆمەتبارکردنی سۆڤیەتیەکان بەپەیوەندی بەستنیان لەگەڵ تیرۆریستی جیهانی (کارلۆس)دا،گەورەترین تۆمەتبارکردن بوو کاریگەریترین یشیان بوو لەسەر پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان ..

(کارلۆس)ناوی ڕاستەقینەی (ئیلیتش ڕامیریز سانشیز)ەو،بۆماوەی (یەك ساڵ) لەزانکۆی (باتریسی لومومبا)لە (مۆسکۆ)ساڵی ١٩٦٨ خوێندویەتی .نەیتوانی درێژە بەخوێندن بدات چونکە سۆڤیەتیەکان لەبەر چەندین هۆکاری ڕەوشتی دەریان کرد. هەرچەندە زۆرێك لە پسپۆرانی سیخوڕی ،کارلۆس بەبەکرێگیراوی سۆڤیەت لە قەڵەم

دەدەن، سەبارەت بەدەرکردنی کارلۆسیش لەسۆڤیەت دەڵێن تەنها فیلێکی سیخوڕی بوو بۆدورخستنەوەی گومان لە (K.G.B) .

لەهەمان ڕوپەڕدا دەنگۆ بڵاوبویەوە کەیەکێتی سۆڤیەت دەستی هەبوبێت لە هەوڵی تیرۆرکردنی (یوحەنا پۆڵسی دووەم)ی پاپای ڤاتیکان لەساڵی ١٩٨١،بەتایبەت لەدوای ئەوەی (محمد علی ئەجکا)ی ڕاپەڕێنەری هەوڵەکە دانی ناوە بەوەدا کەلەبەرژەوەندی موخابەراتی بولگاریا ی هاوپەیمانی (K.G.B) کاردەکات ... پاش ماوەیەکی کەم لە بڵاوبونەوەی پروپاگەندەکە ،(ئەجکا)لەو دان پێدانانەی پاش گەزبوویەوە و ڕای گشتی لەنێو گێژاوی سەرسوڕماندا بەجێ هێشت .ئایا بەتەنها موخابەراتی سۆڤیەت بۆ هەڵخەڵەتاندنی ڕای گشتی زانیاریەکان دەشێوێنێت ؟یاخود هەندێك جار هەندێك لەموخابەراتەکانی ڕۆژئاواش بەشداری ئەم کارەی دەکەن؟

دان پێدانانەکانی (ئەجکا)ئەم دوو پرسیارەی وورووژاند و میسداقیەتی موخابەراتەکانی ڕۆژئاواشی لە مەحەك دا..

بالایەك بکەینەوە بەلای ئەندرۆبوف دا ،تێبینی دەکەین سەرجەم بەڕێوەبەرایەتیەکانی (K.G.B) ئاگاداریان کردۆتەوە لە هەر پلانێکدا کە کێشرابێت بۆ جێ بەجێکردن لەسەر ئاستی کردەوە سیخوڕیەکاندا.لەمیانەی ڕێکخستنی پەیوەندی مەرکەزی لەنێوان ئەو و بەڕێوەبەرایەتیەکاندا، ئەندرۆبوف توانی هەڵمەتێکی سەرکەوتو بەرپابکات لەدژی گەندەڵی و بیرۆکراتیەت لەنێو پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی دا،بەتایبەت هەڵمەتەکەی لە ئازەر بایجان (١٩٦٩)و، جۆرجیا (١٩٧١).. لەسەرەتای هەشتاکاندا ،ئەندرۆبوف تەقەی دا لەدەروازەی بیرۆکراتیەت لەدەوروبەری ڕابەری سۆڤیەتی (لیونید بریجنیف)و گروپەکەیدا.. بۆیە جێگەی سەرسوڕمان نیە لەکاتێکدا (ئەندرۆبوف)کەئەندامی کارگێڕی مەکتەبی سیاسی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت بوو لەساڵی (١٩٨٢)دالەدوای مردنی (بریجنیف)بویە سەرۆکی سۆڤیەت .

2

C № 035848 1971 s

FILIACION
PERSONAL DESCRIPTION

Cédula de Identidad 6365201
Identification Card

Nacionalidad CHILENA
Nationality

Nacido el 1- JULIO - 1947
Date of birth

Estado civil SOLTERO
Marital status

Profesión INGENIERO
Profession

Domicilio PEDRO TORRES 360
Address

Observaciones
Notes

FILIACION
PERSONAL DESCRIPTION

DIGITO PULGAR
THUMB PRINT

FIRMA DEL TITULAR
SIGNATURE OF BEARER

( پەساپۆرتێکی ساختە بە ناوی (ئیلتش ڕامیرێز سانتیز) ناسراو بە تیرۆرستی جیهانی (کارلۆس)، پێویستە بلێین دیارترین کاری تیرۆرستی (کارلۆس) بریتی بوو لە ڕفاندنی (۱۱) وەزیری عەرەبی کە نوێنەرایەتی وڵاتەکانیان دەکرد لە ڕێکخراوی (ئۆپێك) دا ، ئەم کردەوەیە لە کانونی یەکەمی ۱۹۷۵ دا جێ بەجێ کرا ).

لەو دەمانەی (K.G.B) بە دەزگایەکی کارا دەبینرا لە حەفتاکاندا لە نێو یەکێتیسۆڤیەتدا ،(C.I.A) قەیرانی متمانەی هەبوو لەگەڵ هاوڵاتیانی و سیاسەتمەدارانی ئەمریکادا ،چونکە سیاسەتمەداران و هاوڵاتیانی ئەمریکا ئاژانسی (C.I.A) یان تۆمەتبار دەکرد بەوەی ڕێ وشوێنی نێگەتیڤ دەگرێتە بەرو کردەوەی نهێنی نایاسایی ئەنجام داوە لەهەریەکە لە (لاوس،کەمبۆدیا، ڤێتنام، تشیلی....هتد)دا ...

(C.I.A) لەساڵی (۱۹۷۳)بەدزێوترین قەیرانەکانیدا گوزەری کرد ،بەهۆی ئەوەی سەرۆك (نیکسۆن)لەو ساڵەدا،(ڕیتشاردیلمز) ی بەڕێوەبەری ئاژانسەکەی (۱۹۶٦-۱۹۷۳)لە پۆستەکەی دەرکرد،چونکە ئەمی دووەم ڕەتی ئەوەی کردەوە

کەبەشداری بکات لە لێکۆڵینەوەی لابەلا دەربارەی ڕیسواییە بەناوبانگەکەی (ۆترگێت).

پاش ماوەیەك (نیکسۆن)دەست نیشانی (هلمز)ی کرد بۆ پۆستی باڵیۆزی ئەمریکا لەئێران دا،ئەم دەست نیشان کردنە بوویە هۆی وورووژاندنی گومان لەوەی (هلمز) لەمیانەی قەیرانی (ۆترگێت)دا إبتیزازی سەرۆکی کردبێت... کەچی هیلمز خۆی بەئاشکرا ئەم تۆمەتە ڕەت دەکاتەوەو دەڵێت :(لەنێو هەموو ئەو تۆمەتانەی لەدژی خۆم و (C.I.A) بەکاردەهێنرێت ،بەتوندی ئەم تۆمەتە ڕەت دەکەمەوە کەباس لە إبتزازی سەرۆك دەکات)..

شیاوی باسە (هلمز)دڵنیابوو لەوەی ئەو کردەوانەی لەماوەی ساڵانی خزمەتیدا لە (C.I.A) کردونی لە پێناوی نیشتمان دابووە، ئەو لەوتارێکی تایبەتیدا لەساڵی (١٩٧١)دا لەوروەوە دەڵێت:(نیشتمان تارادەیەك پێویستە دڵنیا بێت، ئێمەش ـ پیاوانی (C.I.A) ـ هاوڵاتی دڵسۆزین بۆی و بۆ کێشە گشتیەکانی )..

سەبارەت بە باگراوندی ڕۆشنبیری و سۆسۆلۆژی (هلمز)،لەڕوی جەوهەرەوە هیچ جیاوازیەکی نیە لەگەڵ باکگراوندی ڕابەرە پێشینەکانی (C.I.A) دا ،ئەمیش زانیاریەکانی لە فێرگەو پەیمانگەکانی سویسراو ئەڵمانیا وەرگرتووەو پاشان لە پەیمانگای (سان لویس)لە ساڵی (١٩٣٥)دا دەرچووە ، پاشتر لەبواری ڕۆژنامە گەریدا کاری کردووە(لەڕۆژنامەی "ڕۆژانەی ئەندیانا بۆلس")داو بۆ خزمەت کردن لە (نوسینگەی خزمەتگوزاریە ئیستراتیژیەکان)هێنرایە ژێربار لەماوەی جەنگ دا ،بەکۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی هلمز پەیوەندی دەکات بە (C.I.A) ەوە ئیدی ڕێگە دەبڕێت بەرەو لوتکەی پەیکەرەکەی لەمەڕ موخابەراتی ئەمریکا .. لەسەرەتای ساڵی (١٩٥٩)دا هێندەی خزمەت کردبوو کە بەس بێت بۆئەوەی ڕاستەوخۆ ئاگاداربێت بەسەر هەوڵەکانی تیرۆرکردنی (فیدڵ کاسترۆ)دا ،لەدانیشتنێکی لێپرسینەوەدا کە لیژنەی موخابەراتی سەربەئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا سازی کردبوو لە ساڵی

(١٩٧٥ز)دا ،هلمز ووتی :(کەئەو ڕای خۆی نەگۆڕیوە سەبارەت بەدادگەری ئەو هەولانەی کە هەندێك (بە مافیا)شەوە پێی هەستاون بۆ تیرۆرکردنی فیدڵ کاسترۆ،هەروا ڕونیشی کردەوە کە (C.I.A)هەستاوە بە ڕاپەڕاندنی ئەرکە نیشتمانیەکانی و لەسنوری چوارچێوەی یاسایی ئەو ئەرکانەش دەرنەچووە)...

بەڵام گوتەکانی هیلمز بەرەهایی قەناعەت پێکارنەبوون ،بەتایبەت لەدوای ئەو زنجیرە ڕیسواییەی کە (C.I.A)یان لەرزاند لەسەردەمی بەڕێوەبەرایەتی نوێی (ولیەم کولبی)دا.. لەو ساوەکە لەتەمووزی (١٩٧٣)دا (کولبی) بەرێوەبەرایەتی موخابەراتی ئەمریکای گرتە دەست، داوای لەکارمەندانی (C.I.A) کرد تاکو ڕاپۆرتی ڕەسمی بنوسن دەربارەی هەڵسوکەوتە پێشینەکان و کردەوە نهێنیە نایاساییەکان..بەئامانجی هاوکاری کردنی لیژنە تایبەتەکانی لێکۆڵینەوە بۆ گەشتن بەڕاستی ئەوکردەوانەی (C.I.A) لەسەر دەمی سەرۆك نیکسۆن دا کردوونی ..بیروباوەرێکی وا بلاوبویەوە کە (C.I.A) دەستی وەرداوەتە کاروباری ناوخۆیی کۆمەڵگەی ئەمریکی و وە شوێن هەندێك لەو ئەندامانەدا چووە کە پاڵپشتی بزافی ئاشتی دژ بەشەڕبوون لە ڤێتنام وهەندێکی تریش لە کەسایەتیە سیاسیە توندڕەوەکان ،ئەمەش بەبێ گومان یانی پێشێل کردنی یاسای ئەمریکاچونکە ئەو یاسایە قەدەغەی کردووە (C.I.A) ئەوجۆرە چالاکیە ناوخۆییانە ئەنجام بدات لە ئاکامی بەدوادا چون و لێکۆڵینەوەکانی لیژنەی (روکفلر)و لیژنەی (کەنیسەی سەربە ئەنجومەنی پیران)، (C.I.A) لەماوەی شەڕی ڤێتنام دا(جیمس ئەنگلتۆن)ی کردە بەرپرسی ئەو کردەوانەی ناوی لێنرابوو (کردەوە شپرزەکان)ئەودەستەواژەیە (شیفرە)یەکی زانیاری بوو بۆ پلانێکی سیخوڕی کردن بەسەر کاروبارە ناوخۆییەکانی ولاتەوە ...

هەروەها دەشگوترێت ئەو زانیاریانەی کە هەبوون لە سەر تێوەگلانی (C.I.A) لەتیرۆرکردنی ڕابەرو سەرکردە جیهانیەکان و تێکدانی سیستەمە دیموکراسیەکان لە ئاسیاو ئەمریکای لاتینی دا بوونە هۆی ڕق هەستانی ڕای گشتی ئەمریکاو پالی نا بە

(دادوەری) ئەمریکاوە تاکو (ریتشارد هلمز)بەرپرسی ئەوکاتەی (C.I.A) تاوانبار بکات بەتۆمەتی درۆکردن لەبەرانبەر لیژنەی پەیوەندیە دەرەکیەکان لە ئەنجومەنی پیران دا لەمەڕ رۆلّی (C.I.A)لەتێکدانی ڕژێمی (تشیلی).

ئەنجامی کۆتایی دادگایی کردنەکان بریتی بوو لە فەرمانی زیندانی کردنی (هلمز)بۆماوەی (٢سالّ)و باجێکی دارایش ...

لەئاکامدا کۆنگریس پێی داگرت لەسەر زەرورەتی کۆنترۆلّ کردنەوەی سیاسەتە دەرەکیەکانی ولاّت و دانی سنورێك بۆ هەلّسوکەوتەکانی (C.I.A) لەڕێگەی دانانی زنجیرەیەك ڕێوشوێنی یاساییەوە کە (C.I.A) بەرپرسیار بکات لەسەرجەم کردەوە نهێنیەکانی لەبەر دەم لیژنەی پسپۆری پەرلەمانیدا لەگەلّ هاتنە سەرکاری (کارتەر)لەسالّی (١٩٧١)دا، ئاژانسی (C.I.A) پەروبالّ کراو کردەوەکانی بەژمارەو سنور گەلێك لەقالّب درا ،لەبری هەزارەها کردەوەی ئیداری و نائیداری ڕێگەدرا بە بەڕێوەبەری نوێی (C.I.A) (ئەمیرالّ ستانسفیلّدترنر)تەنها (٣٠٠)کردەوە ئەنجام بدات هەروەها کردەوە نهێنیەکانیش کرانە دووان یاخود سێ کردەولەبری ئەوژمارە بێ سنورەی کە موخابەراتی ئەمریکا پێشتر دەیتوانی بەئارەزووی خۆی کردەوە ئەنجام بدات.

سەبارەت بە (بەشی چالاکیە جیهانیەکان)یش ،ئەرکەکانی گەڕێنرانەوە سەر ئەو ئەرکە بنەڕەتیانەی لەبڕوانامەی دامەزراندنی (C.I.A)دا هاتبوو .. هەرلەهەمان قۆناغدا (پیاوە ئازاکان)دەستیان هەلّگرت لەکردەوە پۆلیسیە ئەندێشەییەکان ،وە گرنگیان دەدا بە سیخوڕی ئەلکترۆنی ئاسمانی لەژێر سەقفی بودجەیەکدا کەلە کۆتایی حەفتاکاندا گەشتە (٤٠٪)ی قەبارەی پێشوی کە لە گرێی شەشەمیدا (العقد السادس)هەیبوو ..لەگەلّ ئەوەشدا ئەم ڕێ و شوێنانە کاری کردە سەر پەیوەندیەکانی (C.I.A) بەئاژانسە دۆستەکانیەوە ،چونکە ئەو ئاژانسانە دلّەڕاوکێی خۆیان نیشاندا لەئاشکرایەتی موخابەراتی ئەمریکا لەبەردەم دەستە دەستوری و یاسا دانەریەکانی

ولاّتدا ..و سلّەمینەوەشی نیشاندا لە گۆڕینەوەی زانیاری نهێنی لەگـەڵ (C.I.A) دا .. ئەمە ڕوداوەکانی سەردەمی سەرۆك (کارتەر)بـوون لـەماوەی چـوار سـاڵی تەمـەنی سەرۆکایەتیەکەیدا ... پرسیار لێرەدا ئەمەیە :ئایا مەسـەلـەکان دەربـارەی (C.I.A) و چالاکیە سیخوڕیەکانی وەك سەردەمی سەرۆك (کارتەر)مانەوە؟ یـاخود ئیـدارەی نـوێ بەسـەرۆکایەتی سـەرۆکی ئـەمریکی (ڕێگـان) مەسـەلـەکانی گـۆڕی و لـەبـەرژەوەندی (C.I.A) شکاندیەوە؟

## بەشی دەیەم

# ﴿ نهێنی و پێداویستیەکانی پیشەی سیخوڕی ﴾

بێگومان نـهێنی و هەڵخەڵـەتاندن و فڕوفێـڵ لـەکاری سـیخوڕی دا دوو ڕەگـەزی بنچینەیین و هەرلەسـەرەتاوە دەبنـە دوو خەسـڵەت و دەچەسـپێن بـەو کەسـەوە سـەر دەکات بەماڵی ئەم پیشەیەدا ،سیخوڕی کردن بەسەر نهێنیەکانی کەسانی ترەوە ،چ نیـە جگە لە کۆمەڵێك فڕوفێڵی بۆگەن و ڕێگای نهێنی گرتنەبەر بۆ وەدەستهێنانی زانیـاری ... وەلێ زەرورياتەکانی پیشەکە،زۆر جار پێویست بەوە دەکات پیشەوەرانی ئەم بـوارە کردەوەی کوشتن و تیرۆرکردن ئەنجام بدەن بۆ بەدەست هێنانی زانیاری داواکراو،ئـەم حاڵەش وادەکات لەلای زۆرینەی هەرە زۆری خەڵك بەپیاوانی پیشە مەترسی دارەکـە بێنە ناوزەدکردن.

لەبارەی ئەم جۆرە کردەوە مەترسی دارانەوە ،موخابـەراتی بولـگاریـا (بـەپێی بـڕوای بـڵاو لـە ڕۆژئـاوادا)کردەوەیـەکی بـێ وێنـەی تـیرۆری ئـەنجام دا،ئـەوەبوو یـەکێك لەبـەکرێگیراوەکانی بۆیەکـەم جـار ،ئـامێرێکی وەکـو لولـەی دەمانچـەی بـەکارهێنا .بۆتەقاندنی پارچە پلاتینێکی بچـوك بـەرەو ڕووی یـەکێك لـەجیابوەوە بولگاریـەکان بەئامانجی کوشتنی .

سیخوڕە بولـگاریەکە توانی (گۆرکی مارکۆف)ی‌جیابوەوە بپێکێت،لەکاتێکدا لەبـەر دەم نوسینگەکانی ئێستگەی بەریتانیا (B.B.C) لە(لەندەن) دا تێپـەڕی دەکـرد ،ئـەم ڕوداوە لەساڵی (١٩٧٨)دابوو... دەڵێن گوایە (مارکۆف) لـەپڕ هەسـتی بـەئازارێك کرد لەڕانی ڕاستی دا بێ ئەوەی هۆکارەکەی بزانێت ،ئەوەندە نـەبێت کەسـێکی نـامۆ

(واته خەڵکی بەریتانیا نەبوو )ی بیـنی کەبـە شـەقامەکەدا ڕای دەکـرد و هـەوڵی دەدا خۆی حەشار بدات و لەبەرچاوی ڕێبوارەکان خۆی بزر بکات .

ئێوارەی ئەو ڕۆژە گەرمی لەشی (مارکۆف)بەجۆرێکی مەترسیدار بەرزبوویەوە ،بۆیـە گوازرایەوە نەخۆشخانە بۆ چارەسەر وەرگرتن ..پزیشکەکان شکستیان هێنا لە زانینـی هۆکاری نەخۆشیە کتوپڕیەکەی ،ئەوەبوو دوای سێ ڕۆژ لەنەخۆشخانە گیانی لەدەست دا ... لـەدوایدا نوژداەکـان ڕایـان گـەیاند :حاڵـەتێکی ژەهـراوی بـوون دوچـاری (مارکۆف) بووە لەئاکامی هەوکردنیدا بەهۆی پارچـە کانزایـەکی دروسـت کـراو لـە پلاتین و (ئەیریدیۆم)..پارچـە پلاتینەکـە لـەڕانی ڕاسـتیدا بـووە و ئـەم جـۆرە تێکەڵـە (کیمیایی ـ کانزایی)ە ،ئاسایی لە دروستکردنی فڕۆکەدا بەکار دەهێنرێت ... لـەکاتی ئامادەکردندا لە فڕنی زۆر گەرم دا تێکەڵ دەکرێن .. نوژدارەکـان لـەدرێژەی پێناسـە کردنی پارچە کانزایەکـەدا گوتیـان :پارچەیـەکی پلاتینـی چەماوەیـەو تیرەکـەی تەنـها (٢ملم)ەو لەهەر چوارلاوە هەڵکۆڵراوە بەهۆی ئامێرێکی تایبەت بەدروسـتکردنی ئـەم جۆرە بابەتە ووردانە..

پزیشکەکان بەکۆتایی هێنان بەڕاپرۆتەکەیان دەبێژن:(مـارکۆف) بـەهۆی ئـەو پارچـە کانزایەوە مردوە کە خوێنەکەی ژەهراوی کردو بویە هۆی بەهێواشی کوشتنی..

گومانی تێدانیە ئەم ڕوداوی تیرۆر کردنە سەرنجی چـاودێرانی ڕاکێشـا بـەرەو چـەند ڕووداوێکـی تـر کەلەبـەردا ڕویـان داو بونـە هـۆی گیـان لەدەسـت دانـــی چـــەند جیابوەوەیەکی سیاسی تـر ..ئـەوەتا لـە مـانگی تـەموزی سـاڵی (١٩٧٣)دا،(بۆریـس (ئەرنۆف))کەپەناهێندەیەکی بولگاری بوو لە (دانیمارك)دەژیا،لە پـڕدا شـوێن بزرکـرا بۆماوەیەکی کورت ، پاشتر لەبەردەم یەکێك لە دادگاکانی بولگاریا لــە (صوفیـا ) ی پایتەخت ڕاوەستێنرا بەتۆمەتی ناپاکی و دوژمنایـەتی کردنـی ڕژێمـی شـیوعی.. ئینجـا فەرمانی (١٥)ساڵ زیندانی کردنی درا بەسەردا.. کەچی (ئەرنۆف) دوای دوو مـانگ تێپەڕاندنی زیندانێتییەکەی لەبارودۆخێکی تەم و مژاویدا کۆچی دوایی کرد..

گۆڤاری لاوانی کۆمۆنیستی له بولگاریا (نارودنی ملادی)لەدوای مردنی( ئەرنۆف) وتارێکی بلاوکردەوە دەربارەی ئەو کردەوەی کوشت و بڕوتاوانانەی (ئـەرنۆف) پێـی هەستاوەو دووپاتیشی کردۆتـەوە کـەمردن چارەنوسـی هـەموو ناپـاك و دوژمنـەکانی سۆسیالیزمه.

لەو ڕوداوەشدا دوبارە تیشك خرایەوە سەر موخابەراتی بولـگاریـا ،ڕووداوەکـە بـەم تەرزە بوو:لەشاری پـاریس لـەمانگی (ئـاب/۱۹۷۸)دا،نـەیارێکی سیاسـی بولـگـاری بەناوی (فلادیمێر کۆستۆف)بەپارچەیەکی پلاتین پێکرا ،بـەلاّم (کۆسـتۆف) توانـرا لـەم هەولّە ڕزگار بکرێت،سەرەڕای دوچاربوونی بەهــەمان حالّەتـەکانی (مـارکۆف) وەك بەرز بوونەوەی لە ڕادەبەدەری پلەی گەرمی و هــەوکردنی خوێـن... لـەئاکامی ئـەو زانیاریانەی لە (لەندەن) بلاوکرانەوە دەربارەی تیرۆرکردنی (مــارکۆف)،پزیشـکەکان توانیان هەست بەمەسەلەکە بکەنو بەرلەوەی کار لەکار بترازێت پارچـە کانزاییەکـەیان لەڕانی (کۆستۆف)دا دەرهێنا ...

ئەو لێکۆلّیارە ئینگلیزیانەی دەستنیشانی تێکەلّە (کیمیایی ـ کـانزایی) یەکـەی ڕانـی (مارکۆف) یان کرد،بەمەبەستی لێکۆلّینەوە ڕوویان کردە پاریس و پاش تاوتوێ کـردن و توێژینەوە لەسەر پارچە کانزاکەی نێو ڕانی (کۆستۆف)ڕایان گەیاند هــەردوو پارچـە کانزاییەکەی ((مارکۆف) و کۆستۆف)دوانــەی لێکچـون و خەسـلّەت و قەبارەشـیان یەکە .ئــەو ژەهـرەش لەهــەردوو ڕووداوەکـەدا بـەکارهێنراوە بریـتی یـە لـە ژەهـری (ڕیسین)ی دەرهێنراو لە ڕۆنی (خروع)ی زەرد..[1]

---

[1] خروع:جۆرێکە لەڕوەکی گژوگیایی ،لەگروپی (فربونیات)ە گەلاّکانی پانکەلەن ،زێدی بنەڕەتی ئەم ڕوەکە کیشوەری ئاسیایە ،لە هەندێك جێگەدا بۆ جوانکاری دەچێنرێت ... بنواڕە (المنجد في اللغة )،چاپی (۳۵).. وەرگێڕی کوردی.

لـــــەم لاشـــــەوە هـــــەردوو دەزگـــــای (K.G.B) و (C.I.A)ئـــــامێری (درۆگر=Polygraph)یان بەکارهێنا بۆلێکۆڵینەوە لـــە ڕاستگۆیی کارمـەندەکانیان یاخود بۆ پەردەلادان لەڕوی میسداقیەتی ئەوانەی تاوانبار دەکرێن بە سیخوڕی کـــردن لەبەرژەوەندی دوژمنان.. ئەم ئامێرە کاردەکات بۆ تۆمارکردنی ئاڵوگۆڕە فیزیاییـەکانی لەشی ئەوکەسانەی خۆدەدزنەوە لە گوتنی قسەی ڕاست لە کـاتی لێکۆڵینـەوەدا،وەك گۆڕانی بۆنمونە ،پەستانی خوێن،گەرمی لەش، ڕێژەی جواناو دەردان کە هەمیشـــە وەك کاردانـەوەی بیۆلـۆژی ڕودەدات لەئـەنجامی هەســت کـردن بـــەترس لەســـەرەنجامی درۆکردن..

ئاژانسی موخابـەراتی ئـەمریکی هەمیشـە لـەکاتی لێپرسـینەوەی تۆمـەتبارکراوەکان داپشتی بەم پرسیارە دەبەست:(ئایـا هیـچ کـات شـتێکت لـەماڵ و موڵکـی دەوڵـەت نەدزیوە؟)ئەمە لەکاتێکدا دەزگاکانی تر کۆمەڵــە پرسـیارێکیان بـەکاردەهێنا ،وەك ئـەو پرسیارانەی خاوەن کاردەیانکات لـەو کەسـانەی پـاڵێوراون بۆوەگرتنـی کـار لــەلای خاوەنکارەکە .. بەهەرحاڵ،ئامێری درۆگر سەرکەوتنی بەدەستهێنا لەئاشـــکراکرنی درۆ لـەبواری سیخوڕی و دژە سـیخوڕی دا ،بـەوەش لـــەنێو دامـــەزراوە ڕەسمیـــەکاندا بـەکارهێنانی بڵاوبویــەوە،جگـە لــە (سـەنتەری پەیوەندیـە حکومیـەکان) لــە بـەریتانیا کارمەندانی ئەو دەزگایە ملکەچ بوون بۆئەو ئامێرەیان بـەتوندی ڕەت کـردەوە،لەبـەر چەند هۆکارێك ،دیارترینیان ،پێشێل کردنی نهێنی یە شەخسیەکان لەلایەن ئەم ئامێرەوە و شکست هێنانیشی لەتۆمارکردنی سەرجەم گۆڕانە فیزیاییـــەکانی لـەش دا کـەزانایان هۆکارەکەیان تەنها بە درۆکردن سـنور بـەند نـەکردووە شـیاوی ئامـاژە پێدانـە ،لـەم ڕۆژگارانەی ئەمڕۆماندا (ئامێری درۆگر) لـەنێو دامـەزراوە بازرگانیـەکانیش دا بـەکار دەهێنرێت بۆ دڵنیابوون لە(سەرڕاستی) کارمەندە تازەکانی دامەزراوەکە ،هەرلەهـــەمان بواردا واتە لەبواری بەکارهێنانی تەکنیکی زانستی لە خزمەتی سیخوڕی دا ،ئەمریکی و سۆڤیەتیەکان هەوڵی بەکارهێنانی داو دەرمانی کیمیاوی تایبەتیان دا بۆکۆنترۆڵ کردنـی

عەقڵی مرۆڤ ،هەرچەندە بەڵگەی تەواو بەدەستەوە نیە لەسەر هەوڵدانی سۆڤیەت لەم ڕووەوە ،وەلێ ئاگاداری تەواومان هەیە بەسەر ئەو پلانانەدا کەئەمریکی یەکان دای دەڕێژن بۆ بەرهەمهێنانی ئەم دەرمانە مەترسیدارانە ،ساڵی ۱۹۵۰(C.I.A) لەڕێگەی ئازمایشکا پزیشکیە بڵاوەکانی وڵاتەوە ،هەوڵێکی سەرەتایی دا بۆبەرهەمهێنانی ئەو دەرمانەی کەناوی لێنابوو (چۆلەکەی شین)،لەپاشدا هەوڵی دووەمی دا بۆ ئامادەکردنی دەرمانێك بەناوی (مکولترا)وە.

لەم کاتەدا (ریتشارد هیلمز)جێگری بەرپرسی بەڕێوەبەری پلاندانانی (C.I.A) لەوکاتەدا پێشنیاری ئەوەی‌کرد ،ئاژانسەکە بڕی (۳۰۰هەزاردۆلار)تەرخان بکات بۆ ئەم پرۆژە زیندەییە (بەگوتەی ئەو)..ئەمەو (ئالن دالس)جیگری بەڕێوەبەری موخابەراتی ئەمریکا لەوکاتەدا ڕاستەو ڕاست قایل بوو بەو پێشنیارە ،بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکەکەو بەڕێوەبردنی پرۆژەی بەرهەمهێنانی دەرمانی ئاماژە بۆکراویشی کیمیایی بەناوبانگ(سۆنی گوتلیب)ی هەڵبژارد.. ئیدی زۆرینەی تاقیگە زانستی یەکان لە زانکۆو بیمارستانەکانی ئەمریکادا خرانە خزمەتی ئەم پرۆژە موخابەراتیەوە ... جگە لەوەش هەریەك لەم دەزگا زانستیانەی لە خوارەوە ناویان دێت پشتگیری پرۆژەکەیان کرد:

- دەزگای (کۆمەڵگە لەخزمەتی زانستی زیندەوەرزانی)دا.
- دەزگای (پەیمانگای ئەندازیاری زانستی).
- (کۆمەڵەی جۆسیا ماکی)بۆلێکۆڵینەوەی زانستی.
- (سندوقی جستشیکتر)بۆ توێژینەوە نوژداریەکانی.

لەلای خۆیەوە ئەمریکا پروپاگەندەی ئەوەی کرد گوایە یەکێتی سۆڤیەت پرۆسەی کۆنترۆڵ کردنی کیمیاییانەی بەسەر ئاوەزی هەندێك لەتۆمەتبارکراو و زیندانیەکانیدا جێ بەجێ کردووە ،(واشنطن)بۆسەلماندنی پروپاگەندەکانی پەنای بردە بەرئاشکراکردنی بارودۆخی هەندێك لەو زیندانیانەی کەوایان نیشاندەدا دووچاری

سەرسورِمیّ بوون لەکاتی دادگای کردنیاندا لە (مۆسکۆ) ... هەروەها (C.I.A) بارودۆخی هەندێك لەو زیندانیانەی ئاشکراکردکە لەکۆریای باکورەوە گەڕابوونەوە ،وەك بەڵگەیەکی سەلمێنەری پروپاگەندەکانی ،نەخاسمەهەندێکیان دووچاری تێکچوونی ژیری و ڕاڕایی دەرونی هاتبون لەدوای گەڕانەوەیان بۆ وڵات.

لە یاداشتنامەکەیدا سەرۆکی بەشی (پزیشکایەتی)سەربە (C.I.A) لەکانونی دووەمی ١٩٥٢دا بۆ بەرپرسەکانی خۆی ناردووە دەنوسێت :(زۆرێك بەڵگەی یەکلاکەرەوە هەیە لەسەر ئەوەی شیوعیەکان مادەی بێهۆشکەری کیمیایی و بەزۆر ڕاوەستاندن و خورپەی کارەبایی و هەندێك جار خەواندنی موگناتیسی شیان بەکارهێناوە بۆزاڵ بوون بەسەر ئاوەزی دوژمن و زیندانیەکانیاندا،لەبەر ئەوەپێویستە لەسەر مان هەستین بە هەڵمەتێکی زانستی تا لەکۆتایدا بتوانین هەمان تەکنیکی نوژداری و زانستی بەجۆرێك بەکاربهێنین تاهەموان دڵنیا بن لەوەی ئەو جۆرە تەکنیکانە لەدەستانێکی ئەمین دا دەمێننەوە و گاڵتە ناکرێت بەئامانجەکانی)...

هەروەها یەکەم سەرۆکی (دامەزراوەی جیهانی نەخۆشیە قلّی یەکان)(د.ئیۆنی کامیرون)چەند تاقیکردنەوەیەکی ئەنجامدا بۆ زاڵبوون بەسەر ئاوەزی هەندێك لەنەخۆشەکاندا ،لەم یانەیەدا ئەم دەرمانانەی بەکار هێنا :(تورازین، نمبوتاڵ، سیکوناڵ، فیرونال، فنرگال) .. (کامیرون)هەوڵی دا مێشکی چەند کەسێکیان بشۆرێتەوە بەبەکارهێنانی پەیامێکی دەنگی کەلە ڕێگەی ئامێرێکی بچوکی تۆمارکەرەوە ئاراستەی دەکرد ،ئامێری تۆمارکردنەکەی خسبوە ژێر(سەرین)ی نەخۆشەکانیەوە ،لەماوەیئەو سی ڕۆژەدا کەنەخۆشەکانی توشی (غیبوبە)ببون بەهۆی بەکارهێنانی ئەو دەرمانانەی سەرەوە لەدژیان.

تاقیکردنەوەکانی کامیرون بونە جێگەی سەرسورِمانی (د.دوناڵدهب)پرۆفیسۆری دەرون ناسی لەزانکۆی (ماك گیڵ)،ئەمی دووەم دەربارەی تاقیکردنەوەکانی کامیرون دەڵێت:(گەر ڕێکەوتایە یەکێك لە قوتابیەکانم پێشنیاری کردەوەیەکی گاڵتەجاڕی وەك

ئەوەی (کامیرون)ی بکردایە یاخود هەربیریشی لێبکردایەتەوە،دەست بەجێ لەزانکۆ دەرم دەکرد).

لەهەمان ڕووەوە چەندین هەوڵ خرایە کار بەمەبەستی پراکتیزەکردنی بنەمای (التجرید الحسي)بەسەر زیندانیە سیاسیەکاندا ،ئەم جارەیان بەهۆی بێهۆشکەری سروشتیەوە ،زیندانیەکانیان بێ هۆش دەکرد ،پەنایان دەبردە بەر ئەومادەیەی کە هندە ئەمریکیەکان دەیانکرد بەنوکی تیرەکانیانەوە تاکو ژەهراوی ببێت و دوژمنەکانیان یاخود نێچیرەکان بێ هۆش بکات .. بەشێوەیەکی گشتی هەموو ئەم هەولانە شکستیان خوارد ،هەرچەندە دەگوترا گوایە موخابەراتی بەریتانیا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە لە بەکارهێنانی بێ هۆشکەرە هندیەکە لەدژی هەندێك لەگیراوەکانی سوپای ئیرلەندی کاسۆلیکی.

بە ڕۆڵی خۆی بەڕێوەبەری سەنتەری (ئیدمان و نەخۆشیە ئاوەزیەکان) لە (لیکزنتون)ی ویلایەتی (کانتاکی)ئەمریکا ،(د.هاریس ئیزابل)ئامادەباشی زیادی دەربڕی بۆ گرنگی دان بە پرۆژەی بەرهەمهێنانی (دەرمانی سیحری)کە (C.I.A)داوای کردبوو بۆ بەرهەڵستی کردنی تەکنیکیە سۆڤیەتیەکە.

(إیزابل)هەریەکە لە مادەکانی (ئیسکۆ پۆلامین)و حەبی(LSD)بەدناوی‌تاقیکردەوە،هێندەی نەبرد (إیزابل)قەناعەتی کرد بەسەرانی (C.I.A) تاکو کەبسولی (LSD)بەکاربهێنن و لەڕاپۆرتێکدا ئەنجامی تاقیکردنەوەی ئەم کەبسولەی بۆنوسیبوون کە بۆماوەی (٧٧)ڕۆژ بەسەر حەوت کەسدا تاقی کردبوویەوە ،بەپێی ئەو ئەنجامە بەدەست هێنراوە (سدنی گوتلیب)ی بەڕێوەبەری پرۆژە کیمیاویەکە داوای لەنەخۆشخانەی (مۆنت سینا)ی ئەمریکی کرد،بەردەوام بن لە توێژینەوەکانیان لەسەر مادەی داواکراو ، هاوکاری و هەماهەنگیش بکەن لەگەڵ پەیمانگاکانی نوژداری لە زانکۆکانی (ئیلنوی،کۆلۆمبیا،ئۆکلاهۆما)بۆ هەمان مەبەست.هەموو ئەم تاقیکردنەوانەش یارمەتی (گوتلیب)یان دا لەدۆزینەوەی ئەو مادە سیحریەی بەدوایدا

وێڵ بوو بۆ کاریگەری خراپ دروست کردن لەسەر هەڵسوکەوتەکانی (فیدڵ کاسترۆ).

لەسەرەتای ساڵی ١٩٥٣دا موخابەراتی ئەمریکا پرۆژەیەکی نوێی دەست پێکرد لەهەمان بواری تەکنیکی سیخوڕی دا ،ئەم پرۆژەی ئێستە (جەنگی خانە بیۆلۆژیەکان)ی لێکەوتەوە، یاخود بەمانایەکی تر ،پزیشکانی (C.I.A) و پەیمانگا زانستیەکانی دەستیان کردە تاقی کردنەوە لەسەر خانەکانی لەشی مرۆڤ لەمیانەی بەکارهێنانی هەمان مادەی (L.S.D)یەوە .

(د.فرانك ئۆلسن)بەویستی خۆی خرایە ژێر یەکەم ئەزمونگەریەوە ،لەم ئەزمونەدا(٧٠ میکرۆگرام)لەمادەی (LSD)لەنێو شوشەیەکی (کوانترۆ)دا،گیرایەوەو دکتۆرئۆلسن یەك پێکی لێخواردەوەو دەست بەجێ هەستی کرد چالاکیەکانی زیاد لەئاستی سروشتی پەرەیسەندوە.. وەلێ ئەم چالاکیە دەستکردە درێژەی نەکێشا،ئۆلسن هەستی بە دڵ تەنگیەکی قوڵ کرد،لەئەنجامدا داوای دیدەنی یەکێك لەپسپۆرەکانی دەرون ناسی کرد..(C.I.A) کەخۆی هەرلەسەرەتاوە سەرپەرشتی تاقیکردنەوەکەی کردبوو،ڕێگەی نەدا بەبەکارهێنانی پزیشکێکی دەرونی شەرعی بۆ ئەم مەبەستە ،لەترسی ئەوەی نەکا مەسەلەکە ئاشکرابێت.. لەبەر ئەوە داوای لە (د.هارولد سینای)کرد تاکو کردارەکانی پشکنین بۆ پزیشکی نەخۆشکەوتوو (د.ئۆلسن)بکات،چونکە بە جۆرێك باری دەروونی تێك چوو بوو لەبەرواری (٢٧-١١-١٩٥٣)و لە ئوتێل ((واشنطن)ستانلر)دا خۆی کوشت ،واتە چوار ڕۆژ دوای خواردنەوەی مادەی(LSD). تاکو مێژوی پەردە لادان لەڕووی بەسەرهاتەکەی (د.ئۆلسن)نەهاتە پێشێ و لیژنەی لێکۆڵینەوەی (روکفلر)لەساڵی (١٩٥٧)دا کردەوەکەی ئاشکرا نەکرد،بنەماڵەی (د.ئۆلسن)نەیان دەزانی (C.I.A) تاقیکردنەوەی کیمیاییان بەسەردا کردوە ،واتە هۆکاری مردنەکەیان نەدەزانی ...
ئیدی لەساڵی (١٩٦٣)دا پرۆژەی بەرهەمهێنانی (LSD)ڕاوەستێنرا .. بۆوەی دەست

بکرێت بەراپەڕاندنی پرۆژەی دیکە بۆ بەرهەمهێنانی ژەهرو دەرمانی سیحری ،کە پەیتا پەیتا (C.I.A) خەونی بە وە دەست هێنانیەوە دەبینی .

سەبارەت بە ئەزمونکاریەکانی سۆڤیەت لەمەڕ ئەم مەسەلەیە (ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی)لە راپۆرتێکیدا لە (مۆسکۆ)وە لەو تاو ماوەیەدا ڕایگەیاند :پەیمانگای (سربسکی)و نەخۆشخانەی (ئۆریول)لە چالاکترین دامەزراوە سۆڤیەتیەکانن لەم بوارەدا ،واتە لەبواری تاقیکردنەوەی کیمیایی بۆ زاڵبوون بەسەر ئاوەزی مرۆڤدا ...

چەند زانیاریەکی تر ئاماژەیان کرد بەوەی (زیندانی لیبیانکا)ی بەناوبانگ لە(مۆسکۆ)، لەنێو ژوورە (ئینفرادیەکانیدا)هەندێك ژووری تەرخان کردووە بۆ ئەم تاقیکردنەوانە بەسەر زیندانیە سیاسیەکاندا ئەو کردەوانەی هەندێك جار دەزگا موخابەراتیە جیهانیەکان پێی هەڵدەستن، فیلمە پۆلیسی یەکانی (جێمس بۆند)مان بیردێنێتەوە ،کەتیایاندا ئامرازی سیخوڕی کردنی خەیاڵی بەکاردەهێنێت.

بەڵام ئەو تەکنیکە بەرزەی چواردەوری پیاوانی موخابەراتی لە دنیادا گرتوە واقعی لە خەیاڵ نزیك کردۆتەوە و وای کردوە پیشەی سیخوڕی ببێتە پیشەی قارەمانو پیاوە زیرەکەکان،بۆنمونە لە ئەوروپا ،واڕێکخرابوو کە بەکرێگیراو کارمەندانی (K.G.B) و (C.I.A) و موخابەراتەکانی ترفەرمانی بەرپرسە باڵاکانیان لەڕێگەی ئاگاداری ڕۆژانەی ڕۆژنامەییەوە پێ بگات ،یاخود بەهۆی ژمارەی شیفرەیی کەبەهۆی شەپۆلی ڕادیۆیی کورتەوە دەگەیەنرا... کارمەندەکان لەدوای بیستن یاخود خوێندنەوەی ژمارە شیفرەییەکان هەڵدەستان بەشیتەڵ کردنی ژمارەکانی بەهۆی تیانوسی جەفەنگەکان کەبە (تیانوسی هەمیشەیی)ناودەبرا..تیانوسەکە کۆمەڵێك پەڕەی بچوك بوو لە کاتی پێویستدا دەتوانرا لە پاکەتی جگەرەدا بشاردرێتەوە ...

بۆئەوانەی لە ئەڵمانیا دەژیان دەیانتوانی گوێگرن لە ڕادیۆی (ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات)تاکو بەئاسانی گوێبیستی ژمارە شیفرەییەکان بن.. ئەوکەسانەش لەبەریتانیا دەژیان لەڕێگەی خوێندنەوەی ڕۆژنامەی (دەیلی تەلەگراف)ەوە بەژمارە

شفرەدارەکان ئاشنادەبوون، بەڕای چاودێران ئەو ڕۆژنامەیە گرنگترین ئامرازی بڵاوکردنەوەی ژمارە شیفرەییەکان بووە... بەخوێندنەوەی چەند نمونەیەکت لەو پەیامە نهێنیانە بەرچاو دەکەوێت کەئەگەر پسپۆڕ نەبێت لەکاروباری سیخوڕی و موخابەراتدا هیچیان لێتێناگەیت.

(بۆریس ئەنیمیسۆفیسش)ی ناسراو بە(ئیفان)یەکێکە لەبەناوبانگترین ئەو بەکرێگیراوانەی (K.G.B) کە تیانوسی هەمیشەییان بەکارهێناوە ،ئەم پیاوەیەکی زۆر لەباڵیۆزخانەی سۆڤیەت لە (لەندەن) دا کاری کردوە و ساڵی (١٩٥٩)ش ڕەوانەی ئوسترالیا کرا، تالە وێندەریش کار بکات بۆ دروست کردنی تۆڕێکی موخابەراتی سۆڤیەتی .. بەڕێکەوت ئەم پیاوە پەیوەندی بەست لەگەڵ ئافرەتێکی سەربەموخابەراتی ئوسترالیادا لە (ملبۆرن).. ئەم ئافرەتە هونەرێکی‌نوێی نیشانی (ئیفان)دا تالەنامەکانیدا بۆی بەکاربێنێت، ئەم هونەرەش بریتیە لە (مورەکەبێکی نهێنی)ونوسین بەم مورەکەبە ناخوێندرێتەوە تاکو مادەیەکی کیمیایی نەکرێت بەسەریدا.. ئیفان لەسەر هەمان لاپەڕە نامەیەکی ئاسایی دەنوسی و لەدیوەکەی تریشی دا بە مورەکەبە نهێنیەکەش نامەیەکی نهێنی دەنوسی و تیایدا داوای ڕاپەڕاندنی ئەرکێکی تایبەتی یاخود چاوپێکەوتنێکی نهێنی دەکرد لەگەڵ ئافرەتە بەکرێگیراوەکەی (ملبۆرن)دا.

هەروەها پسپۆرانی بواری سیخوڕی هەستان بە بەکارهێنانی (میکروفیلم المنقط)ئەم ئامرازە سیخوڕی یە پێکهاتوە لە فیلمێك بەقەبارەی دوو کەوانە یاخود نیشانەی خاڵبەندی( : )،بەم هۆیەوە وێنەی زانیاریەکان دەگیرێتە وە تاکو ڕادەی (خاڵ)بچوك دەکرێنەوە و دەنێردرێن بۆ ئەو سیخوڕەی مەبەستە و،ئەویش لەلایەن خۆیەوە بەبەکارهێنانی (ووردبین)ێکی تایبەتی ڕەمزەکان گەورە دەکات و لێکیان دەداتەوە ...

هەرسەبارەت بە پەیام و نامە سیخوڕی یەکان باس لەوە دەکرێت کەپیاوانی موخابەرات هەستاون بە ئاڵ وگۆڕکردنی نامە لەڕێگەی (سندوقی پۆستی تایبەتی)یەوە کەلە پێشدا ڕێکەوتن لەسەری هاتۆتە ئاراوە.. کۆلۆنێل(ئۆلگ

بلکوفسکی)بەکرێگیراوی بەناوبانگی بەریتانی (ڕادیاتۆر)ی یەکێك لە کۆشکەکانی (مۆسکۆ)ی وەك سندوقی پۆستی نهێنی بەکارهێناوە... لە (فرانك بوسارد)ی بەکرێگیراوی سۆڤیەتیش دەگێڕنەوە کەبەهۆی کون و کەلەبەری نێو کەلەکێکی نیوە ڕوخاوی (لەندەن)ەوە نامەکانی ئالۆ گۆڕکردوە ،یاخود هەندێك جار لەڕێگەی دارو درەختەوە (جان پۆڵ سۆبەرت)ی ئەندازیاری کیمیایی سویسریش،کەلە بەلژیکا موخابەراتی ئەڵمانیا ی ڕۆژهەڵات بۆ بەرژەوەندی خۆی هێناویەتیە ژێربار ،سندوقێکی پۆستی گەڕۆکی بەکارهێناوە بەمەبەستی پارێزگاریکردن لەنامەو دۆکیومێنتەکان ،سندوقە گەڕۆکەکانیشی هەندێك جار پاکەتی معجونی ددان و هەندێك جار ئیسفەنجی پاککردنەوەی ماڵ و هەندێك جاری دیکەش پاکەت و قوتوی شەکولاتە... بووە.

ئەمە لەکاتێکدا ئەندامانی تۆڕی موخابەراتی بەریتانیا لە (پۆرت لاند)پاکەتی شت و مەکی جوانکاری و تایتیان بەکارهێناوە لە ئالوگۆڕ پێکردنی نامە لەنێو خۆیاندا..لەلایەن خۆیەوە ئامێرە ئەلکترۆنیەکانیش ڕۆڵێکی گرنگیان بینی لە سیخوڕی و دژە سیخوڕی دا...لە ئایاری ساڵی ١٩٦٠دا ،باڵیۆزی ئەمریکا لەنەتەوەیەکگرتوەکان (هنری کابۆت لۆدج)،لە کۆبونەوەیەکی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتیدا،پارچە تەختەیەکی زۆر جوان و قەشەنگی خستە بەردەم ئەنجومەنەکە لەسەر ئەو پارچە تەختە دەستەواژەی (مۆری ئەمریکای مەزن)هەڵکەندرابوو،ڕاشی گەیاند:(ئەو تەختەیە دیاری سۆڤیەتیەکانە بۆ باڵیۆزی ئەمریکا لە (مۆسکۆ)،ئەوەشی ڕونکردەوە کەپارچەتەختەکە چ نیە ،جگە ئامێرێکی گوێ هەڵخستن بۆ دزینی زانیاری ،(K.G.B) ویستیەتی بەگەشتنی ئەو تەختەیە بە باڵیۆزخانەی ئەمریکا لەبەرژەوەندی مەرامە سیخوڕیەکانی خۆی بەکاری بێنێت).

لەنێو دەزگا سیخوڕیەکاندا بەگشتی و (C.I.A) بەتایبەتی واباو بوو کەکارمەندە تازەکان بەرلەوەی بخرێنە کاری سیخوڕیەوە ،قاڵ بکرێن لەمەشقی تیۆری و کرداری

قورس دا... موخابەراتیئەمریکا کارمەندە نویٚ یەکانی خۆی لەکامپی (بیری)دا مەشق پێدەکرد،کامپەکە دەکەوێتە ویلایەتی (فیرجینیا)کەناسراوە بە(کێڵگە).

لەو مەشقانەدا خوێندکارەکانی موخابەرات ڕادەهێنرێن لەسەر ئامێرەکانی گویٚ هەڵخستن و کردنەوەی دەرگاو سندوقە نهێنیەکان و چۆنێتی بەکارهێنانیان .. هەروەها وانەی تایبەتیان پێدەڵێنەوە لەسەر لێهاتوویی جەستەیی و چەند وەرزشێکی ژاپۆنیوەك (کاراتی، ئەیکدۆ.....هتد)بەمەبەستی زیادکردنی توانای بەرگری لەخۆکردنی ئەندامانی موخابەرات بەبیٚ پەنابردنە بەر بەکارهێنانی چەك ... سەبارەت بەمەشق کردن لەسەر بەکارهێنانی ئامێری گویٚ هەڵخستن،تەکنەلۆژیای نویٚ گۆڕانکاری هێنا بەسەر شێوازی گویٚ هەڵخستنی کۆن کەپشتی بەئامێری ناردنی بچوك دەبەست (بەقەبارەی دەنکە زەیتونێك)،ئەم ئامێرە بچوکە لەو ژوورو جێگانەدا دادەنران کە پێویست بوو سیخوڕییان بەسەرەوە بکرێت .. ئەمڕۆ موخابەراتەکانی ئەمریکاو بەریتانیا ئامێری کۆمپیوتەر بەکاردەهێنن لەوەرگێڕانی پەیامی تەلەفۆنی شیفرەداردا بۆ پەیامی ئاسایی و ڕاستەوخۆ دەشی گەیەنن بەبەشی زانیاریەکان کەتایبەتە بەو مەسەلانەوە.

ئەم تەکنەلۆژیا نوێیە ئاسانکاری زۆری کردووە لە پرۆسەی سیخوڕی و دژە سیخوڕی نێوان دەزگا موخابەراتیە دۆستەکاندا ،لەنێو دەزگا دۆستەکاندا ،ئاماژە بەئاژانسی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا دەدەین،ئەم دەزگایە ماوەیەکی دوورو درێژ سانسۆری جوجوڵەکانی پەیوەندی تەلەفۆنی و بێتەلی دەزگا موخابەراتەکانی ڕۆژئاوایی دەکر،بەگوێرەی ڕاپۆرتی (فینك)ی کونگریسی ئەمریکی لەساڵی (١٩٧٥)دا،ئاژانسەکە:( سیخوڕی کردوە بەسەر پەیوەندیەکانی بەریتانیای مەزن ،گرنگترین هاوپەیمانەکانی (واشنطن)ەو لەپاش دانپێدانانی یەکێك لەکارمەندانی ئاژانسی ناوبراو لەوێستگەی (کێڵگەکانی فینسیت)لە (وارینگتون)ی ویلایەتی فێرجینیادا،ئەو ڕاستیانە دوپات کراونەوەو سەلمێنران ،کارمەندەکە گوتی:(وێستگەکە

ئامێری قەبەو ستافێکی گەورەی کاری هەیە ،تاکە ئەرکی ئەم وێستگەیە گوێ هەڵخستنە بەسەر پەیوەندیەکانی شانشینی یەکگرتوی بەریتانیاوە).

جۆری ئەو پەیوەندیانەش کە ئاژانسەکە سیخوڕی بەسەرەوەدەکردن،لەپەیوەندی کردنە ئاساییەکانی بازرگانیەوە دەستی پێدەکرد تا بە پەیوەندی کردنە نهێنیە سەربازیەکان کۆتایی دەهات،شیاوی ئاماژە پێدانەپرۆژەی سیخوڕی کردن بەسەر بەریتانیاوە ناوی لێنرا پرۆژەی (الخلاصة العامة)،لەپاش ڕیسواییەکەی ئەم گوێ هەڵخستنە پرۆژەکە داخراو کارمەندەکانی گوازرانەوە بۆ (سان ئەنتۆنیۆ) لەویلایەتی (تەکساس).

لەهەمان چوارچێوەدا بورجەکانی ئامادەکراو بەشەپۆلی (کهرتیسی)بچوك ،وەك (بورجی سەنتەری پۆستە)لە (لەندەن) ،ڕۆڵی کاریگەریان بینی لە پرۆسەکانی گوێ هەڵخستن و سیخوڕی دا .نێردراوە سۆڤیەتیەکان بۆ (سانفرانسیسکۆ)ی ئەمریکا بەبەردەوامی ئامێری (ڕادار)و (هەوایی)تایبەتیان بۆ تەرخانکرابوو بۆ وەرگتنی پەیوەندیەکانی بێ تەل ،ئەم حاڵەتەش لەبورجی (مایفیر)ی بەناوبانگ لە سەنتەرە ستراتیجیەکەیدا لە(لەندەن) ڕەنگ دەداتەوە ،چونکە دەکەوێتە ناوەڕاستی زۆرێك لە باڵیۆزخانە دبلۆماسیەکانەوە...

لەترسی کاریگەری ئەم تۆڕە هەواییانە ،لیژنەی موخابەرات لە کۆنگرێسی ئەمریکی ساڵی ١٩٨٧پێشنیاری کرد ،حکومەت بڕیارێك بسەپێنێت بەسەر دبلۆماسیەکانی سۆڤیەت دا ،ئەوانەیان لە گردۆڵکەکانی (واشنطن)دا نیشتە جێبوون، جێگەی نیشتەجێبوونیان بگۆڕن و لەنێو خودی (واشنطن)دانیشتەجێبن ،بۆ سنور دانانێك لە ئەگەری گوێ هەڵخستنی هەوایی بەسەر نوسینگەکانی دەوڵەتی فیدراڵیەوە ...
بەهەرحاڵ کارایی ئەم ئامێرانە بە سنور داری دەمێننەوە،بەبەراورد لەگەڵ کارایی ئەو گوێهەڵخستنەی دەوڵەتە پێشکەوتووەکان بەهۆی مانگە دەستکردەکانەوە پێی هەڵدەستن... مانگە دەست کردەکان توانایان هەیە پەیامی بێتەل لەدووری دەریا یان

و بەرینەکان و کیشوەرەکانەوە وەربگرن،بەلام مەترسی ئەم تەکنەلۆژیا بەرزە لەوەدامۆڵ دەخوات کە دەستەلاتە ناوخۆییەکان بەکاری بێنن بۆ سیخوڕی کردن بەسەر هاولاتیەکانی خۆیان و چالاکیە رامیاریە نهێنیەکانیانەوە،شانبەشانی مانگە دەستکردەکان موخابەراتە جیهانیەکان ژێردەریایی و کەشتی جەنگی بەکاردێنن بۆ وەرگرتنی زانیاری بێتەل،کەشتي (بویبلو)ی سیخوڕی ئەمریکی ریسواکرا بەوەی کۆریای باکور سالی ١٩٦٨ دەستی بەسەردا گرت لەکاتێکدا بەکرداریکی سیخوڕی کردن هەستابوولەنزیك رۆخەکانی کۆریای باکورەوە.

سەرەرای خەرجی زۆرو زەوەندی ئەم جۆرە کردەوانە،دەولەتە گەورەکان بەردەوامیان داوەبە هەولەکانیان بۆ پێشخستن و پەرەدان بەدەزگاکانی سیخوڕی و ئامێرەکانی ئەم پیشەیە کە بەم دواییانە لە ولاتانی جیهانی سێ یەم دا بەکارهێنانیان زیادی کردووە دەولەتە گەورەکان سامانێکی بێشوماریان خەرج کردبۆ سیخوڕی کردن بەسەر جیهانی سێ یەمەوە لە بەرانبەریشدا جیهانی سێیەم توانیویەتی بیسەلمێنێت کە هەردەم توانای هەیە باجی خوێن لەدەولەتە گەورەکان بستێنێت ،شانبەشانی ئەو باجی دارایی یەی دەولەتە گەورەکان بەخەرجی دەدەن ..لەدەست تێوەردانە نارەواکانیان لەکاروبارەکانی ولاتانی تردا.

(پاکەتی شقارتە بۆ وێنەگرتنی نهێنی ، کۆمپانیای "کوداك" هەزار پاکەتی لەم جۆرەی بەرهەم هێنا بۆ هەڵسوڕاندن و ڕایی‌کردنی کاروبارەکانی نوسینگەی خزمەتگوزاریە ئیستراتیژیەکان لە ماوەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا) .

(دوو جۆرە ئامێری درۆگر).

(هەندێك پێداویستی سیخوڕی سۆڤێتی لە لەندەن ساڵی ١٩٧١ دەستی بەسەرداگیرا) .

(پاکەتی تایتی بۆش ، تۆڕێکی سیخوڕی بەریتانی لەم پاکەتەی بەکارهێناوە بۆ شاردنەوەی
فلیمی بچوک وپێداویستی  سیخوڕی نهێنی) .

(ئەنگوستیلەیەکی نهێنی ، سیخوڕەکان
مایکرۆفیلیمێکی بچوک یان دنکە حەبێکی
سیانیدی ژەهراوی تێدا دەشارنەوە بۆ
خۆکوشتن لەکاتی پێویستیدا) .

## ﴿ دواناکۆکیەکان ﴾

بەهەڵبژێردرانی (ڕۆناڵد ڕێگان)بۆ پۆستی سەرۆکی وڵاتە یەکگرتوەکان لەساڵی١٩٨١دا ،قۆناغێکی نوێ لە سیخوڕی و دژە سیخوڕی نێوان (مۆسکۆ) و (واشنطن)،هاتە ئاراوە... ئەو سیاسەتی دژایەتی کردنەی‌کۆمۆنیزم کەسەرۆکی نوێ گرتبویە بەر ،وای کرد چاو بگێڕدرێتەوە بەو ڕۆڵەی‌درابووە (C.I.A) لەکاروبارەکانی ئاسایشی نەتەوەیی و سیاسەتی دەرەکی دا،لەسەردەمی ڕێگان دا موخابەراتی ئەمریکا هەستا بەئەنجام دانی چەندکردەوەیەکی نهێنی دژی هاوپەیمانەکانی (مۆسکۆ) لەسەرتاسەری گێتی دا... لەبەرانبەردا (K.G.B) هەموو هەوڵ و کۆششێکی چڕکردەوە لەوەدەست هێنانی تەکنیك و تەکنەلۆژیای ڕۆژئاوایدا،بەتایبەت چونکە سەرۆك ڕێگان زری پێدادەگرت لەسەر دابڕینی (مۆسکۆ) لەڕووی تەکنەلۆژیاوە ،و گەمارۆدانی ئەو کۆمپانیا ڕۆژئاواییانەش کەلە ڕوی‌تەکنیکی یەوە مامەڵە لەگەڵ دەوڵەتانی کۆمۆنیستیدا دەکەن...

بۆ ئەم مەبەستە سەرۆك ڕیگان هاوڕێی ملیۆنێری خۆی (ولیەم کیسی)دەست نیشانکرد بۆ پۆستی بەڕێوەبەری (C.I.A) بۆوەی بەشداری بکات لەگەڵیدا لەمەراسیم و ئاهەنگی سەرکەوتن بەسەر کۆمۆنیزم دا،ئەو سەرکەوتنەی لە هەڵمەتەکانی هەڵبژاردندا بەڵێنی دابوو.. لەیەکێك لەگەشتە پروپاگەندەیەکانیدا بۆ هەڵبژاردن ،ڕێگان وتی :(پێویستە پشت ببەستین بەدەزگای بەهێز بۆ تەزوید کردنی حکومەتەکەمان بەزانیاری زیندەیی لەبواری سیاسەتی دەرەکیدا،ووڵاتە یەکگرتوەکان تاکە دەوڵەتە مافی پشت بەستن بەو جۆرە دەزگایانەی لە خۆی یاساغ کردبێت ...

دیاره ئەمەش دروست و ڕەوا نیە). شیاوی باسە (ولیەم کیسی)پاشگری (ستانسفیلدترنر) لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی (C.I.A) دا ،پێشتر لەنوسینگە خزمەتگوزاریە ئیستراتیژیەکان کاری کردووەو، بەیەکێك لەهەرە دوژمنە سەرسەختەکانی کۆمۆنیزم دادەنرێت ... یەکێك لەئەندامانی کۆنگریسی ئەمریکا دەربارەی ئەو دەلێت:(ئەو پیاوە لێبڕاو و دڵ گەرمە تاڕادەی ئەوەی گەر پێویست بکات کردەوەی نهێنی لەدژی ڤاتیکان ئەنجام بدات)..

لەساتێکدا (کیسی)بەڕێوەبەرایەتی (C.I.A) ی وەرگرت ،ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و،ئەفغانستان و ئەمریکای لاتینی ،ململانێی توندوتیژی بە خۆیەوە دەبینی لەنێوان چەپڕەو و ڕاستڕەوەکاندا ئەفغانستان کە لەلایەن ڕژێمێکی سۆسیالیستی هاوپەیمانی سۆڤیەتەوە بەڕێوەدەبرا،لەسەردەمی (ڕێگان)دا ململانێی توندوتیژی سەربازی تێدا هاتەئاراوە ،لەنێوان موجاهیدانی ئەفغان لەلایەك وگروپەکانی سەربەڕژێمیش لەلایەکی ترەوە ... ئەم ململانێیەش ڕێگە خۆشکەر بوون بۆ (C.I.A) تاکو دەست وەربداتە ڕەوشەکەوە شۆڕشگێڕانی ئەفغان و باربو بکات بەچەکی پێشکەوتوی ئەمریکی هەروەها ئالۆزیش باڵی کێشابوو بەسەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کەنداوی عەرەبیدا،ئەمە لەکاتێدا (نیکاراگوا)لە ئەمریکای لاتینی دا ببوە جێگەی گرنگی پێدانی (ولیەم کیسی)،ئەم سوربوو لەسەر بەربەرەکانێ کردنی ڕژێمی چەپڕەوی ئەو وڵاتە بەسەرکردایەتی (دانیاڵ ئۆرتیگا)و یارمەتی دانی شۆڕشگێڕانی (نیکاراگوا)ی ناسراوبە (کۆنتراس)بەمەبەستی ڕوخاندنی ڕژێم .

شیاوی وەبیر هێنانەوەیە (ئۆرتیگا)ی ڕابەری (ساندینی)یەکان لە نیکاراگوا لەتەمموزی ساڵی ١٩٧٩داگەشتە سەر کورسی دەستەڵات ،لەدوای لەکارلادانی دیکتاتۆر(أنا ستازیوسوموزا)، (ئۆرتیگا) لەماوەیەکی کەمدا توانی پایەکانی دەستەڵاتەکەی بەتەواوی بچەسپێنێت ،نەك هەرئەوەندە بەڵکو هۆکاری و کۆمەکی چەپڕەوەکانی (سلڤادۆر)ی هاوسنوریش بکات ،ئەم ڕەوشە ئیدارەی ئەمریکای بەڕابەرایەتی ڕێگان نیگەران کردو

وای لێکرد کۆمەکی سەربازی و مەعنەوی زیاتر بۆ ڕژێمی ڕاستڕەوی (سلڤادۆر) ڕەوانەبکات ،بەبێ پەنابردنە بەر کێ بەرکێ یەکی کراوە لەگەڵ کۆنگرێسی ئەمریکی دا قایل نەبوو بەم جۆرە هاوکاریانە .. ئیدارەی ئەمریکا خۆی کێشا بەهەڵوێستی میانەڕەوی کۆنگرێسی ئەمریکی دا سەبارەت بەو هەوڵانەی دەدران بۆ ڕوخاندنی ڕژێمی چەپڕەوی نیکاراگوا .ئەمەش ئیدارەی ئەمریکای ناچارکرد بەپەنامەکی و نهێنی و بەشێوەیەکی نایاسایی هاوکاری ئۆپۆزسیۆنی نیکاراگوا (کۆنتراس) بکات ،لە کۆتاییدا سەری لە ڕیسواییەکی گەورەی جیهانیەوە دەرچوو کە چەندین ناوی لێنرا ،وەك (ئێران گێت) (وەك ڕیسواییەکەی ۆترگێت).

لەڕاستیدا ڕژێمی چەپڕەوی نیکاراگوا،کەهەندێك بەڕژێمێکی میانەڕەویان لەقەڵەم دەدا ،بەبەراورد لەگەڵ ڕژێمی کوبادا، لەتیڕوانینی ڕێگان ویاریدەدەرانیدا بە (مەترسی سوری شیوعیەت)هاتبوویە پۆلاندن ... (بەرەی ڕزگاری نیشتمانی ساندینی)لەسەردەمی (جیمی کارتەر)داگەشتە دەستەلات ،چونکە ئەم بە هەموو جۆرێك یارمەتیدانی ڕژێمە ڕاستڕەو و دیکتاتۆرەکانی بەنمونەی (ڕژێمی سوموزای ستەم کار)ڕەت دەکردەوە.

بەرەکە پێك هاتبوو لەنوێنەرانی کەنیسەی کاسۆلیکی و دەستە ڕۆژنامەوانیو فیکریەکانی وڵات، شانبەشانی پارتە چەپڕەوە جۆراوجۆرەکان و ڕەوتە جیاوازەکان،و سانديكاى كرێكاران و جوتياران ،ئەم پێکهاتەیەش ئیمتیازی تەمسیلی نیشتمانی لەهەردوو ئاستی دەرەکی و ناوەکیدا دابویە بەرەی ڕزگاری ساندینی ... ئەم پێکهاتە یەکگرتوە وردەوردە لاوازبوو لێك هەڵوەشایەوە بەهۆی داواکاری (ئۆرتیگا) لە (فیدڵ کاسترۆ)ی هاوڕێی بۆیارمەتی دانی لەدروستکردنی ڕژێمێکی سۆسیالیستی نوێ لە نیکاراگوادا .

ئەوەبوو بەکردەوە (فیدلْ کاسترۆ)بەدەم داواکاریەکەیەوە هات و (٥٠٠)پسپۆڕی کولبی ڕەوانەی نیکاراگوا کرد،کە لەنێویاندا ژمارەیەك نۆژدار و ئەندازیار و پسپۆڕی سەربازی دەبینرا.

لەئەنجامی ئەو داواکاریەدا سەرۆك (کارتەر)(یەك ملیۆن دۆلاری)وەك بڕەپارەیەکی نهێنی پێشکەش بەنەیارانی ڕاستڕەوی کاسۆلیکی لەنیکاراگوا کرد،لە هەولێکیدا بۆ ڕاوەستاندنی ئەو پرۆسەی بەرەو شیوعیەت چونەی بەرەی چەپڕەوی میانەڕەو لەنیکاراگوادا ڕووبەڕوی دەبویەو،وەلێ ئەم بڕە پارەیە ئارەزوی ڕێگانیەکان(یانی لایەنگرانی ڕێگان لەنێو پارتی کۆماری ئەمریکیدا)تێر نەکرد بۆ هەڵلوشینی ڕژێمی (ئۆرتیگا) و گۆڕینی بەسیتەمێکی دیکە ،بۆیە دەست بەجێ دوای گەشتنی ڕێگان بەکۆشکی سپی ،ئاماژەی دا بە (C.I.A) تا هەستێت بەئەرکی ڕاهێنان و یارمەتیدانی (کۆنتراس)ی نەیاری چەپڕەوانی حوکم بەشێوەیەکی پەنامەکی ،هەروەها ڕێگان توانی بەر لەدەست پێکردنی مانگی (تشرینی دووەم/١٩٨١)،کۆنگرێس قایل بکات بە بڕینەوەی بودجەیەکی تایبەت بۆ یارمەتی دانی کۆنتراس ،لەم ڕووەوە بۆ سەلماندنی ڕەوایەتی بانگەشەکانی ئەو ڕوداوی سەرکوت کرن و داپلۆسینە ڕامیاریانەی دەهێنایەوە کە لەنێو نیکاراگوا دا ڕووی دەدا،جگە لەوەش گەشەکرنی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕانی چەپڕەو لەسلفادۆر،چەکێکی سەلمێنەر و پاڵپشتێکی چاك بوو بەدەستی ڕێگانەوە... بەوجۆرە ،کۆنگرێس بڕی (١٩,٥)ملیۆن دۆلاری تەرخان کرد بۆ (C.I.A) بەمەبەستی دەست بەکاربوون لەدروست کردنی سەرکردایەتیەکی سەربازی و ڕامیاری لەپەناهێندە نیکاراگواییەکان لە پێناوی ڕوخاندنی ڕژێمی چەپڕەوی (ئۆرتیگا).

هەروەها داواشی کرد لە (C.I.A) چەند کردەوەیەکی نهێنی سازبدات و هێڵەکانی پاڵپشتی سەربازی لەنێوان کوبا و نیکاراگوادا بپچڕێنێت.

بەرەی نەیارەکان یاخود (کۆنـترا) سـەری دانەنـەواند بـۆ فشـارەکانی ئـەمریکا ،بـۆ لـەخۆگرتنی پـەناهێندە ڕامیاریـەکان ،ئەوانـەیان خزمـەتیان کـردووە لەپاسـەوانانی دیکتاتۆری پێشو (سۆموزا)...ئیدارەی ئەمریکا بەم کـردەوەی هـەوڵی دەدا زۆرترین ژمارەی نەیارە ڕامیاریەکان کۆبکاتەوە دژبە چەپڕەوە دەستەڵاتدارەکان ...لەو لاوە ئەم بیرکردنەوە سیاسیە ئۆپۆزسیۆنی نیکاراگوای خستە نێو کـورەی نـاکۆکی ناوخۆییـەوە ،واتە ناکۆکی لەنێوان لایەنگرانی سوموزاو نەیارە زۆر و زەوەندەکانیداسـەری هـەڵدا لەنێو (کۆنترا)دا.. هەروەها ناوبانگی کۆنترا و ئامانجەکانیشی لەکە دار کرد کە گوایـە هەوڵ دەدات بۆ دروستکردنی ڕژێمێکـی سـەربەخۆو ئـازاد ... هـەندێك دەیـان وت ئەسـتەمە لـەژێر سـایەی بونـی هـەندێك کەسـدا کـە مێژوویـەکی دزێویـان هەیـە لـە خزمەتکردنی دیکتاتۆرێکی وەك سوموزا دا،ڕژێمی ئازاد بێتە دامەزراندن.

لەسـەرەتای ١٩٨١ دا (C.I.A) دوو خێوەتگـای ئامـادەکرد بۆڕاهێنـانی سـەربازی لەهـەردوو ویلایـەتی (فلۆریـدا) و (کالیفۆرنیـا)دا،بۆدروسـت کردنـی هـێزێکی سـەربازی ئۆپۆزسـیۆن،ئەمـە لـەکاتێکدا جێگـری بەڕێوەبـەری پێشـوی (C.I.A) ژەنـراڵ (فـون وولـترز)لەناوەڕاستی هەمان ساڵ دا،توانیبوی چەند گروپێکی سەربازی کـە لەبنـەڕەتدا سـەر بەکۆمەڵەکەی سۆموزا بوون،قایل بکات تاکو هەوڵەکانیان یەك بخەن و لـەڕوی سـەربازیەوە لەگەڵ (ڕێکخراوی یەکێتی دیموکراتـی نیکـاراگوا)دا یـەکبگرن... جێگـەی ئامـاژە پێدانـە ژەنـراڵ (وولـترز) هەوڵـەکانی بـۆ یەکخسـتنی ئـەو دو هـێزە لـەکاتێکدا خستەکارکەبینی گروپەکانی سەربە سوموزا کە لـە هندۆراسـی سەرسنوری نیکـاراگوادا مۆڵیـان خـواردوە بەهەماهەنگی لەگەڵ میلشیاکانی یەکێتی دیموکراتیدا ،کەلەبنەڕەت دا لـە (میـامی)فلۆریـدا مۆڵ دراون،دەتوانن هێرشی سەربازی لەدژی سوپای نیکـاراگوا ئـەنجام بـدەن لەناوچـەکانی سنورە ئیستراتیژیەکانی هیندۆراس دا...

لـەپاش ڕەزامـەندی (فرنشیسـکۆ کاردینـاڵ)ی ڕابـەری یـەکێتی دیموکراتـی ،لەسـەر هاوکاریکردن لەگەڵ گروپەکانی سوموزا و پێکهێنانی هێزێکی سەربازی ناوی لێـنرا (هـێزە

دیموکراتیەکانی نیکاراگوا)(C.I.A) شکستی هێنا لە قەناعەت پێکردنی یاخود هەڵخەڵەتاندنی (ئەیدن باستورا گومیز)ی ڕابەری شۆڕشی دیموکراتی بەوەی ڕێچکەی ئەوانی دیکە بگرێت وئەو هێزانەی لە (کۆستەریکا)دان بخاتە پاڵ هێزە دیموکراتیەکان.. ئەیدن پێشتر کابرایەکی چەپڕەو بوو لەسەرکردایەتی (ئۆرتیگا) جیاببویەوە ...

لەساڵی ١٩٨٢دا ،پێکدادانە سەربازیەکانی نێوان (کۆنترا)و(سوپای نیکاراگوا)بویە جەنگێکی کراوەو ئاشکرا بەهۆی هاوکاریە داراییەکانی ئەمریکاوەکەلەنێوان (١٩٨٢-١٩٨٣)دا گەشتە (٦٠ملیۆندۆلار)کۆنترا توانی (١٠هەزار) پەناهێندەی نیکاراگوایی ژێربار بخات بۆجەنگ لەدژی نیکاراگوای چەپڕەو ،هەروەها کۆنترا سودی زۆری وەرگرت لە تیۆەگلانی ڕاستەوخۆی (C.I.A) لەکردەوە سەربازیەکاندا ،پتر لە (١٥٠پسپۆڕی)سەربازی لە (C.I.A) دا ،ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی هێرش و بۆردومانکردن و شەبەیخونەکانی شەوانەیان لەدژی سوپای نیکاراگوا دەکرد،بەدرێژایی سنوری هندۆراس ... هەروەها (C.I.A) فرۆکەوانە ئەمریکیەکانی بەکاردەهێنا بۆ گواستنەوەی پێداویستی و چەك بۆ ئەندامانی کۆنترا لەنێو خۆی نیکاراگوادا،دەشگوترا ئەو فرۆکانە مینیان لە سنورەئاویەکانی نیکاراگوادا چاندوە،بۆوەی گەمارۆی دەریایی ئەو وڵاتە بدەن .

(مینە دەریاییەکان)سەریەشەی زۆری دروست کرد بۆ وڵاتە یەکگرتوەکان ،چونکە خۆی بەتاوانبار دەبینی لەدوای لێکۆڵینەوە لەو سکاڵایەی حکومەتی نیکاراگوا پێشکەشی دادگای نێو دەوڵەتی سەربەنەتەوە یەکگرتوەکانی کرد.

لەوەڵام دانەوەی ئەم ڕیسواییەو چەندین ڕیسوایی تری پەیوەست بە سەرکردایەتی کۆنتراس و ڕۆڵی تاوانکارانەیان لەکردەوەی ڕەشەکوژی گومان لێکراودا بەسەر ئەمریکادا هاتبوو،کۆنگرێسی ئەمریکی لە حوزەیرانی ١٩٨٤دا ،قایل نەبوو هاوکاری و دارایی سەربازی کۆنتراس زیاتر بکات و،(ڕێگان)یشی ئاگادارکردەوە لە درێژکردنی باسکی (C.I.A) بۆ کردەوەی نهێنی لەنێو نیکاراگوادا.

ئەوەشی زیاتر کۆنگرێسی قایل کرد بەڕەوایی بڕیارەکەی ئەم دواییانەی و پاڵپشتیەکی جەماوەری بەرفراوانیشی بۆ بڕیارەکە دروستکردلەنێوخۆی ئەمریکاو لەسەر ئاستی

هەڵوێست وەرگرتن لە مەڕ نیکاراگوا... بریتی بوو لەمەسەلەی ئەو ڕۆیسواییەی ناوی لێنرا (نامیلکەی موخابەراتی)ئەوەبوو (C.I.A) هەستا بەدابەشکردنی نامیلکەیەك بەسەر سەرکردەکانی کۆنترا داو داوای لێکردن کاربە ئاراستەکاری و بنەماکانی بکەن کەلەبنەڕەتدا ڕێنمویی دەکرد بۆ ئەنجامدانی کردەوەی دەرونی (استفزازی)لەدژی حکومەتی نیکاراگوا.. ئاراستەکاریەکانی ئەو نامیلکەیە لەخولگەی چۆنێتی هەستان کردەوەی کوشتن و شوێن بزر کردن و ئەشکەنجەداندا دەخولایەوە ،بەجۆرێك ببێتە هۆی وسەرهەڵدانی ڕاپەڕین لەنیکاراگوادا .

هەرچەندە کۆشکی سپی هەرجۆرە پەیوەندیەکی خۆی بەو نامیلکەیەوە ڕەتکردەوە بەڵام گۆڤاری (نیوزویك)ی ئەمریکی ،پەردەی لادالەڕوی ئەو ڕاستیەی کەهەندێك لە بەرپرسە بڵند پایەکانی نێو ئیدارەی ئەمریکا بەشداریان کردووە لە نوسینی ئەو ئاراستەکاریانەدا ،بەنمونەی (ژینی کیرکباتریك)ی ژنە نوێنەری ئەمریکا لە (نەتەوە یەکگرتوەکان). سەرچاوەی خودی ڕیسواییەکەش (ئیدگار شامۆرۆ)یەکێك لە سەرانی کۆنتراس بوو (شامۆرۆ)لەوانەبوو کەبەتوندی پەیوەندی کردنی لایەنگرانی سۆموزای بە بزافی ئۆپۆزسیۆنەوە ڕەت دەکردەوە، هەرئەمیش یەکێك بوو لەوکەسانەی باجی هەڵوێستی خۆیان دا لەدوای ئەوەی (C.I.A) لەڕوی مادی و مەعنەوی یەوە پشتی تێکرد و دەستی لەیارمەتی دانی هەڵگرت لێرەدا ئاماژە بەوە دەدەین نامیلکەکە کەلەژێر سەردیڕی (کردەوە سایکۆلۆژیەکان لە شەڕی پارتیزانیدا)نوسرابوو ،بویە هۆی ڕق هەستانی کۆنگرێسی ئەمریکا لەدوای چاو خشاندن بەسەر چەند بڕگەیەکیدا .. بەتایبەت ئەم بڕگەیەی کەتیایدا هاتووە :(پێویستە تاوانبارە پیشە وەرەکان بەکاربێنین بۆ سەرکردایەتی کردنی هاولاتیان بەرەو ڕوبەڕوبونەوەی دەستەو یەخە لەگەڵ دەستەڵاتدارانی نیکاراگوادا ،تاحاڵەتی تەقەکردن و کوژران و شەهیدبونی لێ بکەوێتەوە باشتریشە گەر لەکاتی کۆبونەوەی خەڵکدا هەندێك لەئەفسەرە گەورەکان بکرێنە ئامانج و بکوژرێن بەوەی ڕۆڵێکیان پێبدرێت لە کێشەکەدا )...لەژێرکاریگەری ئەم ڕیسواییەو چەندین ڕیسوای دیکەدا کۆنگرێسی ئەمریکی لەساڵی ١٩٨٥ هەمو کۆمەکە

داراییەکانی خۆی لە (کۆنترا)گرتەوەو ئەو ڕێکخراوەیان کردە بارمتەی هاوکاریە نایاسایی و نهێنیەکانی (C.I.A) کە کات ناکتێك پێشکەشی ڕێکخراوەکەیان دەکرد.

سەرانی (C.I.A) بەپارێزێکی توندو تیژەوە مامەڵەیان دەکرد لەگەڵ هاوکاریە نهێنیەکاندا بۆ خۆدورخستنەوە لەڕیسوایی دیکەی هاوشێوەی ئەو ڕیسواییانەی لە حەفتاکاندا ناوبانگی ئاژانسەکەیان لەکەدارکردبوو.هەروەها دەشگوترێت موخابەراتی ئەمریکا چەندین جار فشارەکانی ئیدارەی ئەمریکای ڕەت کردۆتەوە بۆ ڕاپەڕاندنی کرداری نهێنی لەنیکاراگوادا .ئیدارەی ئەمریکا لەلایەن خۆیەوە (کۆلۆنێل ئۆلیفەرنورث)ی ڕەوانەی کامپەکانی کۆنتراس کرد ،بەمەبەستی دڵنیاکردنەوەیان لەوەی ئیدارەکەی سەرۆك ڕێگان سورە لەسەر هاوکاری کردنیان تاکو سەرکەوتن بەدەست دێنن بەسەر ڕژێمەکەی (ئۆرتیگا) .هەروەها ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیش بەهاوکاری کۆنە بەرپرسەکانی (C.I.A) چەند هەڵمەتێکی کۆمەك کۆکردنەوەی سازکرد بۆهاوکاری کردنی کۆنترا ،بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندیان کرد بە هەندێك کۆمەڵەی ڕاستڕەوی توندڕەوی نێو ئەمریکاوە، وەك :

- کۆمەڵەی دۆستانی ئەمریکا.
- پەیوەندی جیهانی دژ بەکۆمۆنیزم .
- سەربازەکانی سامان.
- دامەزراوەی نێودەوڵەتی.

جگە لەوەش هەندێك لەو خەلەبانانەی لەبەردا لەڕیزەکانی (C.I.A) دا خزمەتیان کردبوو لە وڵاتانی (لاوس و ڤێتنام)دا خۆیان تەرخانکرد بۆ فڕین بەسەر ئاسمانی نیکاراگوادا بۆ گواستنەوەیچەك و پێداویستی تر بە کۆنترا .دیارترین خەلەبان لەم ڕووەوە ژەنراڵی خانەنشین (ریتشارد سوکورد)بوو ، هەر ئەمیش سەرپەرشتی گواستنەوەی چەك و تفاقی جەنگی کردبوو بۆلاوس ،پاشتر بوویە بەڕێوەبەری گروپی (ستانفۆرد بۆ تەکنەلۆژیاو بازرگانی).دەشگوترێت هەر ئەم گروپە بوون هەستاون بە تەحویل کردن و ڕێکخستنی کردەوەکانی (ئۆلیفەر نورث)ینهێنی لەمەڕ نیکاراگوا.لەنێوەڕاستی ساڵی١٩٨٦یشدا(نورث)و (سۆکورد)ئەو یارمەتیانەی بۆ کۆنترایان کۆکردبویەوە بە

(٤,٥)ملیۆن دۆلار مەزەندە کرد لەئابی ١٩٨٦دا کاتێك کۆنگرێــس بـەڕەسمی بڕیـاری دا دوبارە باربوی کۆنترا بکاتەوە ،( نورث)سەرقاڵی سەودای نهێنی بوو لـەتەك ئێراندا ،لـەپاشدا سەری لـەڕیسواییەکەی (ئـێران گێـت)ەوە دەرچووئـەم ڕیسـواییەش کۆمەڵگـەی ئـەمریکای لـەرزاندو بوبە خورپەیەك بۆنێو وجودی ئەو کۆمەڵگەیە ئیدی هەواڵ و دەنگ وباس بەخێرایی بڵاودەبونەوە سەبارەت بە پرۆتۆکۆلی فرۆشتنی چەك بە ئێران ،ڕیسواییەکە پــەردەی لـەڕوی چەندین ڕاستی لادا بەرلـەوەی کۆلۆنێل (نورث)لەئایاری ١٩٨٧دا بەبەدلە ســەربازیەکەیەوە بۆ بەرگری لەخۆکردن دەربکەوێت لـەلایەکی ترەوە سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی لە ئـێران بە سەرکردایەتی (ئایەتوڵڵاخومەینی)لەساڵی ١٩٧٩دا بوویە هۆی پاشەکشە کردنی نفــوزی وڵاتە یەکگرتوەکان لە ڕۆژهــەڵاتی نـاوێن دا ،وەهـانی گروپـە ئیسـلامیەکانی نێـو جیـهانی عەرەبیشی دا تــاکو هـێرش بکەنـە سـەر سیاسـەتەکانی (واشـنطن)لەهـەرکوێدا بڕەخسێت لـەبەیروت لـەنیسانی ١٩٨٣ هێرشێکی بەو شێوە ڕوی دا ئەوەبوو موســولمانێك بـەخۆیی و ئوتومبیلە بەمین چێنراوەکەیەوە خۆی کرد بەنێو باڵیۆز خانەی ئـەمریکادا لــە وێـندەر خـۆی تەقاندەوەو بوویە هۆی ڕوخاندنی بەشێکی سەر بەباڵیۆزخانەکـەو کوژرانـی ٦٠ کارمـەندی باڵیۆزخانەکەش کە بەلایەنی کەمەوە حەوتیان سەربە (C.I.A) بوون و (ڕۆبەرت ئەیمس)ی بەرپرسی تـۆڕی (C.I.A) لـەبیروت لـەنێو کوژراوەکـاندا بـوو ... هـەروەها لـەئازاری ١٩٨٤ دا ڕێکخراوێکی نهێنی سەربە ئێران هەستا بە ڕفـاندنی (ولیـەم بـاکلی)بەڕێوەبـەری نوێی تۆڕی (C.I.A) لەبەیروت بەوەش بارمتەیەکی دیکەی هێنایە ڕیزی بارمتەکانی تریەوە لە لوبناندا سەرەڕای پروپاگەندەکانی سەرۆك ڕێگان و لێدوانەکانی کەتیایدا پێی دادەگـرت لـەسەر نەکردنیمامەڵـە لـەگـەڵ ئەوانـەی نـاوی لێنـابوون (تیرۆریسـت)، کـەچی لـەو لاوە ئیدارەی ئەمریکاو (C.I.A) سەرگەرمی سات و سەودای نـهێنی بـوون بـۆ بـەرەلاکردنی (باکلی) و دەستگیرکراوەکانی تر ، لـەبەرامبەر پرچەك کردنی ئێران دا ،کــەزۆری پێویست بوو لـەکاتی شەڕەکەیدا لـەگەڵ عـێراق ئەنجومـەنی ئاسایشـی نەتـەوەیی ،تۆڕێکـی پـەیوەندی وگواستنەوەی نهێنی سازاندبوو لـەساڵی١٩٨٦دا بۆ دەست کـردن بـە جـیٚ بـەجیٚ کردنـی پرۆژەی بەنهێنی پرچــەککردنی ئـێران ، ئەرکەکـەش بـە ژەنـراڵ(ئۆلیفـەرنورث)و ژەنراڵـی

خانەنشین کراو (سۆکورد)سپێردرا،شان بەشانی هەندێك لەبەرپرسانی کۆمپانیای فڕۆکـەوانی (گواستنەوەی هەوایی باشور)،ئەم کۆمپانیایە پێشتر مولکـی (C.I.A) بـوو ... لـەکۆتایدا هەولـەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بۆ بەرەلاکردنی (باکلی) بەبادا چوو چونکەهـەواڵی مردنی لە دیلێتـی دا بلاوکراوەیـەوە... هەرچـەندە موخابـەراتی ئـەمریکا لـە هەولـەکانیدا بەردەوام بـوو بـۆ ئـالوگۆڕکردنی ئـەو نهێنیانـەی (بـاکلی) سـەبارەت بـە بـەکرێگیراوانی (C.I.A) لە ڕۆژهەلاتیناوەڕاست دا درکاندوونی لەبەرامبەر چەکدا بۆ ئێران لەئاکامی ئەم هەولـە وەگەڕخراوانەدا لەلایەن ئەمریکیەکانەوە لــە شـوباتی ١٩٨٦دا یەکـەم بـارە چـەکی ئەمریکی گەیەنرایە ئێران ،بەهاوڕێیەتی هەریەك لـە (ئۆلیفـر نـورث)و ڕاوێژکـاری ئاسایشـی نەتەوەیی(ڕۆبەرت ماکفرلین)کە هەردوکیان زنجیرەیەك کۆبونەوەی نـهێنیان لەگـەڵ هـەندێك بەرپرسی ئێرانیدا گرێدابوو.

لــەدوای سـێیەمین بارەچـەك کەبوشـــە کۆتایـــەمین بـــار لـــە ١٩٨٦/١٠/٢٩دا (دیفیدجاکۆبسن)بەرەلاکرا ،بەلام نامۆیی مەسەلەکە لەوەدا نەبوو کە ئیدارەی ئەمریکا هێندە بوێر بوە توانیویەتی پێشێلی هەلوێستی ڕەسمی ئەمریکا بکات سـەبارەت بەچـەك فرۆشـتن بـە ئـێران ، بـەلکو لـەوەدا بـوو کـە سـەرانی ئـەم ئیدارەیـە قـازانجی فرۆشـتنی چەکـەکانیان ڕەوانەیهێزەکانی کۆنترا کرد لە هندۆراس .

لەکۆتاییدا ئیدارەی ئەمریکا خۆی لـە تەنگـەلانێکی چـارەنوس سـازدا دیتـەوە بـەجۆرێك پێگەکانی سیاسەتە دەرەکیەکانی هێنایە لـەرزە بـەرەنجامی داسـتانە منداڵانـەکانی (C.I.A) یشی وەبیر ڕای گشتی هێنایەوە کەلەبەردا پێی هەستاوە.

(ولیەم کیسی)بەڕێوەبەری (C.I.A) لەوکاتەدا ،مردن دەربازی کرد لــە ڕیسـواییەکەی (ئـێران گێـت)،ئەوەبوو سـالی ١٩٨٧ پـاش یـەك سـاڵدوچار بوونـی بـە شـێرۆ پەنجـەی کوشندەیسەر کۆچـی دوایـی کـرد.سـەرۆك ڕێگـانیش بەڕێوەبـەری (F.B.I=نوسـینگەی لێکۆلینەوە فیدرالیەکان)(ولیەم ویستەر)ی لەجێگەکەی دانا پاش ئەوەی بۆ ئــەم و سـەرانی (C.I.A) ڕوون بویەوە جێگرەکەی (ولیەم کیســی)ناسـراو بـە (ڕۆبـەرت گێـت)دەسـتی

هەبووە لە ڕیسوایی (ئیران گێت)دا، تاڕادەیەك دووری خستەوە لە جێگە گرتنەوەی بەڕێوەبەرە مردووەکەی.

سەرەڕای ئەو تەنگەلانە ،کردەوە تاوانکاریەکانی کۆنترا لەدژی نیکاراگوا بویە هۆی باسك ئەستور بوونی حکومەتی چەپڕەوی ئەو وڵاتە لە هەردوو ئاستی ناو خۆیی و دەرەکیداو هەوڵەکانی ڕێگان و یاریدەدەرەکانیشی بۆ ڕوخاندنی ڕژێمی (ئۆرتیگا) پوچەڵ کردەوە .

لەبەرامبەریشدا ،(K.G.B) جێ پێی خۆی لەدەستەڵاتی سۆڤیتیدا قایم کرد لەدوای گەشتنی (یۆری ئەندرۆبوف)ی بەڕێوەبەری (K.G.B) بەپلەی ڕابەرایەتی حیزبی شیوعی و یەکێتی سۆڤیەت ، لەجێگە خۆی (فکتۆر تشبریکۆف)ی دەست نیشان کرد بۆدرێژەدان بە تەقەللاکانی دژی گەندەڵی و بەرتیل خۆری لە یەکێتیسۆڤیەت دا ،لەدوای مردنی (ئەندرۆبۆف)و گەشتنی (میخائیل گۆرباتشوف)بە دەستەڵات ، ڕۆڵی (K.G.B) پەرەی پێدرا لەمیانەی بەرزکردنەوەی (تشبریکوف) بۆ ئەندامێتی تەواو لە مەکتەبی سیاسی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی دا .

باسك ئەستورکردنی (K.G.B) و ئەورۆڵە گەورەی پێی درا پاڵی نا بە هەندێك سیاسەتمەدارەوە تاکو گومان دەربڕن لە بانگەشە ڕیفۆرمی و ئاشتەواییەکانی گۆرباتشۆف چونکە ئەو بانگەشانە پێچەوەانە دەبنەوە لەگەڵ پشت ئەستورکردنی ڕۆڵی (K.G.B) لەنێو وڵات و جیهانی دەرەوەشدا...لەکۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکاندا (K.G.B) هەستی کرد،ناچار بووە ڕێ و شوێنی مووخابەراتی و ڕێگەی نادروست بگرێتە بەر بۆ وەدەست هێنانی تەکنەلۆژیای ڕۆژئاوایی و (مایکرۆشیب)ی بەکارهێنراو لە کۆمپیوتەری نوێ دا ،بەتایبەت چونکە یەکێتی سۆڤیەت دەستەوسان بوو لەکڕین یاخود بەرهەمهێنانی (مایکرۆشیب)،ڕۆژئاوا گەمارۆی فرۆشتنی هەندێك بەرهەمی تەکنەلۆژی خستبووە سەر یەکێتی سۆڤیەت لەبەرچەند هۆکارێکی هێمنایەتی ،بەو پێیەی یەکێتی سۆڤیەت ئەو تەکنیکە نوێیانە بەکاردێنێت لەبەرەو پێش بردنی میکانیزمی سەربازی خۆیدا.

ساڵی ١٩٨١ نوسینگەی لێکۆڵینەوە فیدراڵیەکان F.B.I مەزەندەی ئەوەی کردبوو (٣٥٪)ی سەرجەم دبلۆماسیەکانی سۆڤیەت لە ،لاتە یەکگرتوەکاندا ،لەبەرژەوەندی

(K.G.B) کاردەکەن،نەخاسمە لەشارەکانی (واشنطن،نیویورك،سانفرانسیسکو)،چونکە موخابەراتی سۆڤیەتی لەو شوێنانەدا مۆڵگەی خۆیقایم کردبوو،لەنزیکی سەنتەرە هێمنایەتی و بێ تەلەگرنگەکانەوە.

باڵیۆزخانەی سۆڤیەت لە واشنطنهەوای خاوەن لەرەلەری بەرزی هەڵکردوە،هەندێك لەو لەرە لەرانەی ئاراستەی پەنتاگۆن و کۆشکی سپی کردوە،بەشێکی دیکەشی ئاراستەی بارەگای (C.I.A) کردوە لە(لانگلی)سەربەویلایەتی(ڤێرجینیا).هەروەها سۆڤیەتیەکان بەئەنقەست هەستاون بە درستکردنی ناوەندێکی وەرزشی لەنزیك یەکێك لە ویستگەکانی پەیوەندی کردنی سەربازیەوە ،لەسەر شەپۆلی کورت لەناوچەی (ئەنا پۆلیس)ی ویلایەتی(مێریلاند).. لەنیویۆرکیش،بەتایبەت لەناوچەی (ریڤردیل)،سۆڤیەتیەکان لەدامەزراوەکانی نیشتەجێ بوونی خۆیاندا کەل و پەلی هەوایی پێشکەوتویان داناوە بۆوەرگرتنیپەیوەندی و شەپۆلە سەربازیەکانی ئەمریکا ،ئەمە لەکاتێکدا قونصولیەتی سۆڤیەت لە (سانفرانسیسکۆ) سکاڵای کرد لەدەست وەرگرتن و شیکردنەوەی ئەو پەیامە بێ تەلانەی لەهەردوو بنکەی ژێر دەریایی ناوکی(دۆڵی سیلیکۆن)و دورگەی (میر)ەوە،دەردەچن.

(ثیودۆر گاردینەر)ی کارمەندی(F.B.I) دەربارەی نەوعیەتی کادرانی (K.G.B) لەولایەتە یەکگرتوەکاندا دەڵێت:(ئەوانە باشترین جۆرن ئەوانە لەریزی سەرتاکانن)!! بۆنمونە سەرنجی (دیمتری‌یاکوشکین)بدە،کەماوەیەکی دورودرێژ سەرکردایەتی تۆری (K.G.B) کردوە،بۆمان دەرکەوتوە لەنەوەی یەکێکە لە گەورەترین سەرکردە سەربازیەکانی شۆرشی ئۆکتۆبەری (١٩١٧)ی کۆمۆنیستی.

یاخود هەربۆنمونە سەیری(ڤلادیمێر کازکۆف)ی بەرپرسی (K.G.B) لەنیویۆرك دەکەین ،دوبینین یەکێکە لەوانەی لەبەردا رابەرایەتی بەرێوەبەرایەتی یەکەمی موخابەراتیان لە(مۆسکۆ) گرتۆتە دەست.

سەبارەت بەو شێوازی کارەی K.G.B گرتبویە بەر لەولاتە یەکگرتوەکاندا بۆ دەست کەوتنی زانیاری ،دەشێت باڵیۆزخانەی سۆڤیەت لە (واشنطن)باشترین نمونە بێت بۆپەردەلادان

لەڕوی ئەوشێوازە سۆڤیەتیەبە ئەمریکی کراوەی پەیڕەوی کردوە بۆ سیخوڕی کردن بەسەر خەڵکانی ترەوە.

ئەندامانی ئەو بەشەی ناونراوە (استخباراتی سەربازی)لە باڵیۆزخانەی سۆڤیەتدا،هەمیشە لەو بارانە دەمۆڕانەوە کەلەناوەندە سەربازیەکانەوە نزیك بوون... کارمەندە (مەعلوماتی و تەکنەلۆژیەکان) یش لەیانەکانی زانیاری و مەعریفەدا دەبینران ،سەرەڕای بونی شێوە هەمیشەییان لەبەشەکانی زانیاریو تەکنەلۆژیا لە پەراوگەکانی ئەمریکا دا...

سەبارەت بەو شێوازە لەخشتە بردنە سۆڤیەتیەی لە ئەمریکا دا پەیڕەو دەکرا ،کارمەندێکی پێشوی C.I.A بەناوی (هاری روزتسکی) دەڵێت:(هاولاتی ئاسایی ئەمریکی وادەبینێت دارایی تاکە ڕێگای دڵنیایی و کامەرانی یە ،لەسەر ئەم بنچینەیە هاولاتی ئەمریکی چاو ناپۆشێت لەهەر سەرچاوەیەکی وەدەست هێنانی دارایی ئەگەر خرایە بەردەمی)...(روزتسکی)لەکاتێکدا وای گوت،کەباسی لەو شێوازی لەخشتە بردنە دەکرد کە K.G.B لەئەمریکا دا پەیڕەوی لێدەکرد ....ئەم شێوازە تارادەیەکی زۆر سەرکەتوو بوو لە ژێر بارخستنی یەکێك لەئەندازیارانی (کۆمپانیای هوتج)ی فڕۆکەوانی بەناوی (ولیەم هۆڵدن بل)،ئەم سەبارەت بەتێوەگلانی خۆی لەتەك موخابەراتی سۆڤیتی دا، لەبەردەم (F.B.I)دا گوتبوی کە سەرەڕای لە خشتە بردنی دارایی ،هەڕەشەشی لەلایەن یەکێك لەبەکرێگیراوە پۆلۆنیەکانەوە لەسەر بووە، بەوەی ئازاری خێزانەکەی دەدات گەربێت و بەردەوامی نەدات بە دزینی پرۆسەی دزینی زانیاری .

لە میانەی دان پێدانانەکانی (هۆڵدن بل)ەوە،(F.B.I)توانی پەی بەرێت بەمەرامەکانی سۆڤیەت لە سیخوڕی کردن بەسەر دامەزراوەکانی دۆڵی (سیلیکۆن)ی سەربازیەوە .

ئەم دۆڵی (سلیکۆن)ە ،پێکهاتوە لەناوچەیەکی فراوان لە نزیك سانفرانسیسکۆدا،(٦٠٠)کۆمپانیا لەو ناوچەدا کار دەکەن بۆ ڕاپەڕاندنی پرۆژە حکومیەکانلەبواری تەکنیکی نهێنی پێشکەوتودا.

لە نزیك (لۆس ئەنجەلوس)یش کۆمپانیای هاوشێوەی کۆمپانیاکانی (دۆڵی سلیکۆن)هەیە،لەوێندەریش (٣٥٠)کۆمپانیای تەکنەلۆژی تایبەت بەتەکنیکی نهێنی

کاردەکەن بۆ دەستکەوتنی زانیاری لەسەر ئەم کۆمپانیا تەکنەلۆژیانە ،K.G.B هەبونی خۆی لەناوچەکانی نزیك (سانفرانسیکۆ)چڕ کردەوە... بەگوێرەی (F.B.I)،موخابەراتیسۆڤیەت لەوێدا (٦٠کارمەندی سەربە K.G.B بوون ،جگە لە ٢٥ کارمەندی تری سەربە موخابەراتی سەربازی ...دبلۆماسیە ڕەسمیەکانی سۆڤیەتیش تەنها کاریان بریتی بوو لە کۆکردنەوەی زانیاری تەکنەلۆژیئەمریکی لەوهەندێك لەوکارتلانەی داراییان خۆش دەوێت ،و لەژێر کاریگەری دارایی دا ئامادەن هەموو نهێنی یەك بدرکێنن).سالّی ١٩٨١ هاولاّتی ئەمریکی بەرەچەلّەك سۆڤیەتی (ئەناتۆنی مالوطا)٥سالّ زیندانی کرانی درا بەسەردا،بەتۆمەتی سیخوری تەکنەلۆژی لەبەرژەوەندی K.G.B ،(مالوطا)تۆمەتبارکرابوو بەناردنی ئامێری کۆمپیوتەر و پێداویستی تەکنەلۆژی تر بەبری (٨-١٠)ملیۆن دۆلار بۆ یەکێتی سۆڤیەت ،پاش ئەوەی وەزارەتی (بازرگانی و گومرگ)ی ئەمریکا توانی پەردە لابدات لە ڕوی پەیوەندی ژێربەژێری (مالوطا)بەیەکێك لەگەورەترین ڕفێنەرانی تەکنەلۆژیا لەجیهاندا (ورنر بروتشهازون)ی ملیۆنێری ئەلمانی ،ئەم پیاوە ماوەیەکی دورو درێژ هەولّی دا تەکنەلۆژیا ئەمریکیەکان لە ئەلمانیای ڕۆژهەلاتەوە بگەیەنێتە یەکێتی سۆڤیەت ،بۆ ئەم مەبەستە (مالوطا)ی وەك کرێگرتە و دەسکەلایەکی خۆی لە ئەمریکادا بەکار هێنا.

لەراپۆرتی وەزارەتی بازرگانی ئەمریکا تایبەت بە کێشەی (مالوطا)هاتوە: ئەم کابرایە چەندین داواکاری ڕەوانەی (فەرماندەیی پەیوەندیەکان لە سوپای ئەمریکی)داو (پەیمانگای موخابەرات لە قەلاّی هواتشوکا)کردوە،بەمەبەستی کرینی تۆرو هەوایی کەلەسەر شەپۆلی زۆر کورت کاردەکەن ،بەلاّم (مالوطا)ئەم خواستەی بۆ نەهاتۆتە دی،بەپێچەوانەی پروپاگەندەکانی خۆیەوە کە گوایە (فەرماندەیی پەیوەندیەکان) قایل بوون بە داواکاریەکەی و خەریك بوە ئامێرەکەشی بۆ ڕەوانە بکەن ... وەزارەتەکە لەکاتێکی دوایی تردا ئەوەی ئاشکرا کرد کەچەند کۆمپانیایەکی نهێنی تۆری هەواییو ئامێری کۆمپیوتەریان چنگ کەوتوەو ڕفاندویانە بۆ یەکێتی سۆڤیەت.

لە سەرەتای هەشتاکاندا (٩٠)دبلۆماسی سۆڤیەتی لــە ولاَتــە جۆربــەجۆرەکاندا دەرکــران بەتۆمەتی کۆکردنەوەیزانیاری نهێنی بەم تەرزە.

- ♦ (٤٠) دبلۆماسی لەفەرەنسا دەرکران.
- ♦ (٤) دبلۆماسی لەبەریتانیا دەرکران.
- ♦ (١٨) دبلۆماسی لەئێران دەرکران.
- ♦ (٣) دبلۆماسی لەولاَتە یەکگرتوەکان دەرکران.

وە لە بەلژیکا سالَی (١٩٨٣)،بەڕێوەبەری (کۆمپانیـــای بەلژیکی-ســۆڤیەتی)بۆکاروبــاری بازرگانی (یڤتگینی میخائیلۆف)دەرکرا،دوابەدوای ئەم لەنیوەی دووەمی هەشتاکاندا ،ولاَتــە یەکگرتوەکان ژمارەیەکی زۆری سۆڤیەتیەکانی دەرکرد و لە ئەنجامدا شەپۆلێکی بــەرفراوانی (دەرکردن و دژە دەرکردن)لەنێوان پایتەختە ڕۆژئاواییەکان و (مۆسکۆ) دا هاتە ئاراوە .

سـالَی (١٩٨٦) ولاَتــە یــەکگرتوەکان توشــی سەرەسوڕێ هــات بــەهۆی جیابونـــەوەی (ئیدواردلی هاورد)ی کۆنـــە کارمــەندی (C.I.A)یــەوە، (ئیــدوارد هــاورد) توانیبــوی ئــەو کارمەند و بەکرێگیراوانەی (F.B.I) بخەلَەتێنێت کە چاودێری جموجولَەکانیان دەکرد بەرلە هەلاَتنی بۆ یەکێتی سۆڤیەت ).

(هاورد) بوکە شوشەیەکی لـــە شـێوەی خــۆی بــەکارهێناو لەپێشــی ئوتومبێلەکــەیدا دانــا بۆچاوبەست کردنی F.B.I و خۆشی لـــەدەرگای پاشــەوەی مالَەکەیــەوە دەرفرتــی و تێــی تەقاند، ئاشکرایە (فیتالَی یۆرتشنکۆ)ی کۆنە بەکرێ گــیراوی ســۆڤیەت بەرلــە دووســالَ لــە ڕاکردنی (هاورد) ئاگاداری دابوو بە(F.B.I) لـــەڕاکردن و هــەلاَتنی (هــاورد) و ئەوەشــی ئاشکرا کردبوو کە (هــاورد)لەبــەرژەوەندی (K.G.B)کاردەکــات . هــەندێك لەڕۆژنامــە ئەمریکیەکان ڕایانگەیاند گوایە یەکێك لەوانەی کــار لەبــەرژەوەندی (C.I.A)دەکــەن لــە (مۆسکۆ)دا کوژراوە،دوای ئەوەی سۆڤیەتیەکان لە ڕێگەی (هاورد)ەوە پەی یــان بــردوە بــە پەیوەندیەکانی ئەو کابرایە ...

هەرلەسەر ئاستی چالاکیە سیخوڕی یەکانی سۆڤیەت لە ئەمریکادا ،سـالَی ١٩٨٦ تیشــك خرایە سەر مەسەلەی دەستگیر کردنـــی(گــادی زخــارۆف)بەتۆمــەتی ســیخوڕی کــردن بــۆ

(K.G.B)و دزە پێکردنی زانیاری (تەکنەلۆژی- هونەری)بۆ یەکێتی سۆڤیەت ،ئەم زخارۆفە (فیزیازان)ێکی سۆڤیەتی بوەو لە ساڵی (١٩٨٢)ەوە لە ئەمریکا ژیاوە ،یەکێکیش بوو لەو (٣٠٠)کەسەی لە (ڕازگرایەتی) نەتەوە یەکگرتوەکاندا کارمەند بوون،نوسینگەی لێکۆڵینەوە فیدراڵیەکان ڕایگەیاند لەکاتێکدا(زخارۆف) دەستگیرکراوە،کە هەوڵی داوە بڕی (١٠٠٠ دۆلار)بداتە کارمەندێکی ئەمریکی لەگەڵ یەکێك لە بەڵێندەرەکانی (پەنتاگۆن)داکاری دەکرد بەمەبەستی بەدەست خستنی زانیاری نهێنی جگە لە وانەش (F.B.I) پڕوپاگەندەشی دەکرد کە پیاوەکانی توانیویانە لیستی ناوی سیخوڕانی موخابەراتە بانیەکان لە یەکێك لە دۆلابەکانی ئۆتۆمبیلەکەی (زخارۆف)دا بدۆزنەوە ... ئەوەندەی نەبرد ،زخارۆف بەرەلاکرا لەبەرامبەر بەرەلاکردنی ڕۆژنامەڤانی ئەمریکی (نیکۆلادانیلۆڤ)دا کە (K.G.B)دەستگیری کردبوو بە تۆمەتی سیخوڕی کردن لە بەرژەوندی (C.I.A).

پرۆسەی گۆڕینەوەی هەردوو دیلەکە بەر لەژوانی کۆبونەوە بەناوبانگەکەی (سەرۆك ڕێگان و گۆرباتشۆف)بوو لە (ریکجا فیك)،لە ئاکامی ئەم کۆبونەوەیەدا نیشانەی کرانەوەی سیاسی نێودەوڵەتی لە نێوان ساڵانی (١٩٨٦-١٩٨٧)دا هێدی هێدی بەدەردەکەوت ،هەرچەندە پرۆسەکە خاڵی نەبوو لە هەندێك تەنگ و چەڵەمە کە کردەوە سیخوڕی یەکانی بەرلە کۆبوونەوە بەناوبانگەکە ببونە هۆی سەرهەڵدانی .

ساڵی ١٩٨٧ وڵاتە یەکگرتوەکان ڕای گەیاند باڵیۆزخانەکەی لە (مۆسکۆ)دا لەبار و گونجاو نیە بۆ ئەوەی ببێتە سەنتەرێکی دبلۆماسی پارێزراو لە سیخوڕی کردنی سۆڤیەتیەکان بەسەریەوە، هەروەها(K.G.B)یشی تاوانبارکرد بە چاندنی جۆرەها ئامێری گوێ شنە وتن لە دیواری باڵیۆزخانەکەدا لە ساتەکانی دروستکردنی بیناکەدا،هەریەك لە ئەمریکی و سۆڤیەتیەکان لە حەفتاکاندا قایل بوون بەدروستکردنی دوو باڵیۆزخانەی نوێ لە (مۆسکۆ) و(واشنطن)دا ...

هەرلەو تاو ماوەیەدا ،(کۆنگریس)هەوڵی دەرکردنی یاسایەکی دەدا کە ڕێگە نەدات سۆڤیەتیەکان ئەو خانوانەی نیشتە جێ بوونیان لە (واشنطن) بەکار بێنن کە ئەمریکی یەکان

بەسەنتەری سیخوڕی کردنی دەبینن بەسەر تۆڕە پەیوەندیـە نهێنیـەکانی ئـەمریکاوە هـەروەها بەپێی ئەو یاسایە دەبوایە سۆڤیەتیەکان ئەو خانوانە چۆڵ بکەن.

سەرەڕای ئەم ئاوەڵابونە ڕامیاریەی لە گۆڕەپانی نێو دەوڵەتیدا دەبیـنرا کـە چـی نیشـانەی پرسیار لەدەوری ڕۆڵـی (C.I.A)لەباشوری ئەفریقادا بویە جێگەی تێڕامان لــە کیشـوەری ئەفریقا و هەموو گێتی دا... ئەوەتا لە کـاتێکدا ئیدارەکـەی (سـەرۆك کارتـەر)شانبەشـانی دەوڵەتە ئەوروپیەکان پاڵپشتی خۆی ڕاگەیاند بۆ سەپاندنی گەمارۆی ئـابوری و تـەکنۆلۆژی بەسەر حکومەتە ڕەگەز پەرستەکەی باشوری ئەفریقادا، کەچی بـاڵی ڕاسـتڕەوی (C.I.A)و ئیدارەی ئەمریکا لەسەردەمی (ڕێگان)دا، هەوڵیان خستبویە کار بۆ هاوکاریکردنی حکومەتی باشوری ئـەفریقا لــەدەربازبون لـەو دابڕانـە تەکنۆلۆژیـەی تێـی کـەوتوە ،وە قـەڵاچۆکرنی سەرکردایەتی (کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی)لە مەنفادا. توندڕەوە ئەمریکیەکان پاساویان بـۆ ئەم مەسەلەیە ئەوەبوو شیوعیەکان بەتەواوی دەستەڵاتیان سـەپاندوە بەسـەر ئاڕاسـتە کردنـی سیاسەتەکانی کۆنگرەی نیشتمانی بەسەرۆکایەتی(نێلسن ماندێلا)دا ،بەو پێیە سەرکەوتنی ئەو گروپە لەباشوری ئەفریقادا یانی سەرکەوتنی سۆڤیەتیەکان .

شیاوی باسە لە ساڵی (١٩٦٢ز)دا فەرمانی زیندانی کردنی هـەتا هـەتایی سـەپێنرا بەسـەر (نێلسن ماندێلا)دا بەتۆمەتی هەوڵدان بۆڕوخاندنی حکومەتی ڕەگەز پەرستی باشوری ئـەفریقا .هـەروەها (C.I.A)بـە هاوکـاری موخابەراتـەکانی بـەریتانیاو ئـەڵمانیا ی ڕۆژئـاوا توانـی حکومەتە ڕەگەزپەرستەکە باربوو بکات بە پێداویستی و تەکنۆلۆژیای نـوێ بـۆ پـەرەرپێدانی میکانیزمە سەربازیەکانی و دژایەتی کردنی (کۆنگرەی نیشتمانی ئەفریقی).

ساڵی (١٩٤٨ز)کۆبونەوەیەکی نهێنی گرێدرا لــەنێوان موخابـەراتی بـەریتانیاو ئـەمریکادا لەبارەگای (پەیوەندیە حکومیەکانی بەریتانیا) لەوکۆبونەوەیـەدا نوێنـەرانی موخابـەراتی سـەر بەباشوری ئـەفریقاش ئامـادەبوون و ڕێکـەوتن مۆرکـرا لەسـەر ئـاڵ و گۆڕکردنـی زانیـاری سەربازی و هەواڵدەری لەنێوان هەرسێ دەزگا موخابەراتیەکەدا،بەو مەرجەی باشوری ئەفریقا ڕاپۆرتی هێمنایەتی بداتە ئەمریکیەکان لەسەر جموجوڵـەکانی سـۆڤیەت لـە ئاوەکـانی (رجـاء الصالح)دا وجموجوڵەکانی (کوبا)ش لە (ئـەنگۆلا و مۆزەمبیـق)دا .جگـە لەوانـەش باشـوری

ئەفریقا ڕاسپێردرا بە چاودێری کردنی جموجوڵەکانی سۆڤیەت لە ناوچەی بیابانەکانی باشور و (نامیبیا)دا،لە بەرامبەردا باشوری ئەفریقا داوای لــە (C.I.A)کــرد زانیــاری بداتــێ لەســەر چالاکیەکانی (کۆنگــرەی نیشــتمانی)و بەرپرســەکەی لــە مــەنفادا (ئۆلیڤــەر تــامبۆ)و نیــازو مەرامەکانی ڕژێمەکانی حوکمی هەریەك لە (مۆزەمبیق،ئەنگۆلا،بوتسوانا،زامبیــا)کــە نــەیار و بەرهەڵســتکاری حکومەتــە ڕەگــەز پەرستەکەی باشــوری ئــەفریقا بــوون... موخابــەراتی بەریتانیاش لەو کۆنگرەیەدا ئەرکی چاودێری کردنی ئەو پەیوەندیانەی خستە ئەســتۆی خــۆی ،کەســەرانی (کۆنگــرەی نیشــتمانی)لــە مــەنفادا لەمیانــەی ســەنتەری (پەیوەندیــە حکومیــە بەریتانیەکان )ەوە لە (زامبیــا)گرێــی دەدەن،شــیاوی وەبــیر هێنانەوەیــە هــەندێك لەبەرپرســە ئەمریکیەکان هەرجۆرە پەیوەندیەکی ئیدارەی ئەمریکایان بــەم کۆبونەوەیــەوە ڕەتکــردەوە وە کۆبونەوەکەشیان بەتوندی پرۆتستۆ کردبەڵام هەندیکی تر لەبەرپرسەکان بەنمونەی سیناتۆری ڕاسڕەو(جیسی هلمز)هانی بەردەوامێتی ئــەم جــۆرە هاوکاریانــەیان دەدا لــە گــەڵ باشــوری ئەفریقادا، بەمەبەستی قەڵاچۆکردنی چالاکی کۆمۆنیســتەکان و ســۆڤیەت لەبەشــی باشــوری ئەفریقادا .

سەرەڕای نارەزایی ئەورووپیەکان و زۆرینەی ئــەندامانی کۆنگرێســی ئــەمریکی لــەم ڕەوتــە موخابەراتیە کەچی (C.I.A)درێژەی دا بەم کۆبونەوانە.

لەناوچەیەکی تری ئەم جیهانەدا ،هەماهەنگی یەك هاتە گۆڕێ لەنێوان (C.I.A)یەکێك لە گەورە بەرپرسانی پۆلیسی بەریتانی دا بەناوی (ژۆن ستالکر)،ئەم بــەڕەسمی داوای لێکرابــوو لێکۆڵینەوە بکات لەسەر چەند کردەوەیەکی کوشتن و دەست درێژی کە پۆلیســی بــەریتانیا لە باکوری ئێرلەندا دژی هاوڵاتیە مەدەنیە ئاساییەکان پێــی هەســتاوە بــە تۆمــەتی پــەیوەندی بونیان بە (ســوپای نــهێنی ئێرلــەندا)وە جــا(C.I.A)و (ســتالکرد) ویســتبویان هەماهــەنگی یــەکدی بکــەن بــۆ دڵنیــابوون لەڕاســتی ئــەم پروپاگەندانــە کــەچی (M15)(موخابــەراتی بەریتانیا)بەتوندی لەدژی ئەم هاوکاریە وەستاو چــەندین تۆمــەتی خســتە پــاڵ(ســتالکر)و لــە ئەنجامدا لەسەر کارەکەی دەرکراو دۆسیەی لێکۆڵینەوەکەش داخرا.

جگە لەو قسەو قسەلۆکانەی هەبوون لەسەر رۆڵی (M15)لە کێشەکەی (ستالکر)دا،حکومەتەکەی(مارگریت ڤانشەر)لەساڵی ١٩٨٧چاوی هەڵتۆقی بەرپسوایەتیەکی تردا لەمەڕ کردەوە نهێنیەکانی(M15)، ئەوەبوو لەو ساڵەدا یەکێك لە کۆنە کارمەندەکانی موخابەراتی بەریتانیا بەناوی (بیتەر رایت)پەرتوکێکی بڵاوکردەوەتیایدا بەڕێوەبەری (M15)(ڕۆجەر- هۆلیز)(١٩٥٦-١٩٦٥)تۆمەتبارکردبوو بەکارکردن لەبەرژەوەندی سۆڤیەت ،ئەو زانیاریانەی سەر ڕاست کردەوە کە (تشابمان لبینشر)ی پسپۆڕی سیخوڕی لەپەرتوکەکەی (ناپاکی پیشەیانە)دا ئاماژەی پێدا بوو.

هەروەها (ڕایت)ئەوەشی وەبیر هێنابویەوە کە (٣٠)هاوەڵی ئەم لە (M15)ساڵی ١٩٧٤ پلانێکیان دارڕشت بۆ لەنێو بردنی کابینە حکومیەکەی پارتی کرێکاران لەسەر ئەو باوەڕەی کەسەرۆکی حکومەتیە کرێکاریەکەی ئەو ساڵە (هارۆلد وێلسۆن)بەکرێگیراوی سۆڤیەت بووە،هەروەها (ڕایت)دانیبەوەدا نا بوو کە (K.G.B) ساڵی ١٩٦٣سەرۆکی پێشوی پارتی کرێکاران(هۆگ گایتسکل)ی کوشت،بۆئەوەی ڕێگە لەبەردەم (هارۆلد وێلسۆن)دا والابکات ،تاکو بەئاسانی پۆستی سەرۆکایەتی (پارتی کرێکاران)بگرێتە دەست.

حکومەتەکەی (ماگرێت ثانشەر)ئاگاداری (خانەی بڵاوکردنەوەی ئوستڕالی) کردەوە لە ئاکامە خراپەکانی چاپکردنی ئەو پەرتوکەو دابەشکردنی و کێشەکەشی ڕوبەڕوی دادگاکانی ئوستڕالیا کردەوە ،بۆ بەرگری کردن لەم کێشەیەش (ثانشەر)(ڕۆبەرت ئەرمسترۆنگ)ی ناردە بەردەم دادگا ،ڕۆبەرتیش بۆخۆی یەکێك بوو لەئەندامانی (لیژنەی موخابەراتی هاوبەش).

گەر بەوردی سەرنج بدەین لەم دێڕانەی ڕابوردن،دەتوانین لە میانەیانەوە ڕوی ڕاستی ئەو کردەوە نهێنیانە ببینین کەکات ناکاتێك دەزگا موخابەراتە جیهانیەکان پێی هەڵدەستن ... لە هەندێك کاتدا دەزگا موخابەراتیەکان سنوری خۆیان دەگرن و چەردەیەك بەپێی ئەخلاقیاتی کار دەجولێنەوە و خزمەتی ئاسایشی نەتەوەیی و ژیانی نەتەوەکەیان دەکەن ،لە هەندێك کاتی تریشدا ئەو دەزگایانە بەپێی ئارەزوی خۆیان دەجولێنەوە وەك دابڕان لە پەیکەری دەستەڵاتە ڕەسمیەکانی وڵاتەکانیان.

بۆنمونە کردەوەی تایبەت ئەنجام دەدەن لەدژی هەندێك کەسایەتی و ڕژێم کە لەگەڵ سیاسەتەکانیاندا پێك نایەن ،یان خۆدەگلێنن لە جەنگی بچوکەوە ،لەکاتێکدا ئەم جۆرە جەنگە هیچ خزمەتێك ناکەن بە وڵاتەکانیان وپەیوەندیە دبلۆماسیەکانی ،بۆیە پێویستە ئەم دەزگایانە هەمیشەو هەردەم بەرپرسیاری کردەوە نادروستەکانیان بن لەبەردەم یاسا و دەستەڵاتی وڵاتدا...

باجۆرێکیش پشت ڕاستی کردەوەکانیان بکرێتەوە،کە ڕەوابێت کەسێك لەپێناسەکرنیاندا بڵێت:(چالاکیەکان لەخزمەت و بەرژەوەندی ئاسایشی نەتەوەیی)دان .

# ناوەرۆك



کۆمپیوتەر و فۆتۆکۆپی دلێر/سلێمانی- شەقامی مەولەوی -تەنیشت بانکی سەلام